

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿ مافەکان ﴾

پێناسەی الترکە :- لە رووی زمانەوە – ترکە – بریتی یە لەوەی کە مردوو لە دوای خۆی جێی هێشتوە .بەلام لە رووی شەرعەوە زانایان رەحمەتی خوایان لەسەربی چەند رای جیاوازیان هەیە و پیناسەی جۆراو جۆریان هەیە ئەوەی کە لێرەدا باسی دەکەین تەنها ئەو پێناسە باس دەکەین کە جمهوری زانایان باسیان کردوە ئەویش ئەمەیە:

﴿ ترکە: بریتی یە لەو شتانەی کە مردووەکە لەدوای خۆی بەجێی دەهیلێ لە مولك و سامان و ئەو مافانەی کە پەیوەندی هەیە بە مال و مولك یان یان شتی تر جا قەرزدار بێت یان نا وە قەرزەکەی چ لەو قەرزانە بێ کە پەیوەندی هەیە بە مولك و سامانەکەی وەك قەرزی رەهن وە یان پەیوەندی هەبی بە خودی مردوەکە وەکو قەرزی خۆی یان مارەیی نەیدابی کە پیی دەگوتری – دیون مرسلە – ﴾

مەبەست لە مال و مولك وسامان ئەوەیە کە لەمافی مردووەکەیە وهی خۆیەتی جا لە ژیاندا لەبەردەستی خۆی بوبێ یان لەبەردەستی جێگرەکەی وەکو بەکرێ گر یان بە ئەمانەت وەرگر یان لەبەر دەستی زەوت کارە .

وە مەبەست لە مافەکان بریتی یە لەو مافانەی کە مال یان ئەژمار ناکرێ بە مال و سامان لە خودی خۆی بەلام دەخەملێنرێ بەمالێ وەکو مافی چونە سەر بانی بیناکە وەیان زیاد بون لە نرخی شتەکە وەکو مافی خواردنەوەو مافی هاتو چۆ یان ئەو مافانەی کە لایەنی مالێیەکەی زیاترە لە لایەنی کەسایەتی واتە لایەنە مالێیەکە بە ترجیح دانراوە .

ئەو مافانەی پەیوەستە بە میرات :- بە کورتی چوار ماف هەن پەیوەستن بە تەریکەی مردوەکە :-

- ئامادەکاری مردووەکە
- دانەوەی قەرز.
- وەسیەت .
- میرات.

## ﴿ مافی یەکەم // ئامادەکردنی پێاویستی مردووەکە ﴾

**مەبەست لە ئامادەکاری کردن بۆ مردووەکە:-**

بریتی یە لەو کارانەی کە ئەنجام دەدرێن لە ساتی مردنی کەسەکە تاوەکو شاردنەوەی کە هەرچی مەسرەف و خەرجیات پێویستە بکری بۆ مردوەکە وەکو شوشتن و کفن کردن و هەلگرتن و شاردنەوە ئەگەر بە پارەبیت بەلان بەبیّ زێدە رۆیی و بەبیّ رەزیلی کردن . واتە ئەم خەرجیەی باسمان کرد دەگۆرێ لە کەسێك بۆ کەسێکی ترەوە بەگوێرەی حالی مردووەکە لە ژیان بەلام لەگەل چاودیری کردنی واجب واتە مام ناوەند کە شەرع باسی کردووە .

تێبینی :- زۆر گرنگە ئاماژە کردن بە کاریکی بەربلاو لەناو خەلك ئەویش خەرجیات و مەساریفی تازیە دانان لە هینانی قورئان خوین و ونان ئامادەکردن و ..... ئەمانە هەمووی پیچەوانەی شەرعە و هیچ پەیوەندی بەشەرعەوە نیە و لەمافەکانی مردوو ئەژمار ناکریّ و و لەسەر میراتگران واجب نیە خەرجیەکە بدەن تەنها ئەگەر هەمویان بریاری لەسەر بدەن و منالیش نەبن واتە ئەگەر مردوەکە منالی بچوك و گەورەی  هەبیّ ئەوا منالە بچوکەکان هیچیان لەسەر حیساب ناکریّ جا ئەگەر یەکیك لە میراتگران لەبەشی تایبەتی خۆی سەرفی کرد ئەوە هی خۆیەتی وە ئەگەر بیانیەك خەرجی کردبی ئەوە بە خۆبەخش و تبرع ئەژمار دەکری .

شێوازی کفنی شەرعی :- کفنی شەرعی بۆ پیاو بریتی یە لە سیّ پارچە قوماش باشتر وایە لۆکەبێت یان کەتان بەلام ئاوریشم دروست نیە. وە بۆ ئافرەتان واباشە پێنج پارچە بێت وە دروستە لە ئاوریشم بێت بەلام نابیّ زیان بە میرات گران بگەینیّ  وە لەمانەی باسمان کرد زیاتر بیّ ئەوە زێدەرۆیی و ئیسرافە ، هەروەها چۆن پێویستە مەسرەفی ئامادەکاری مردووەکە لە میراتەکە بدریّ ئەوا بەهەمان شیوە ئەگەر کەسیك مرد لەوانەی نەفەقەی لەسەر مردوی یەکەمە پیش شاردنەوەی مردوی یەکەم لەمیراتی مردوی یەکەمە مەسرەفەکەی بەلام ئەگەر هاتوو مردوەکە هیچ میراتی نەبوو ئەوا واجبە لەسەر ئەوکەسانەی نەفەقەیان دەکیشا لە خزمانی ئەو مەسرەفەی بۆ بکەن ئەگەر نا لە سەر موسلمانان واجبە ئەنجامی بدەن.

## ﴿ مافی دووەم // دانەوەی قەرز ﴾

**جۆرەکانی قەرز:-** قەرز دەکریّ بە دوو جۆر:-

١- قەرزی خوا

٢- قەرزی ئادەمیزاد.

قەرزی ئادەمیزاد دەکریّ بە دوو بەش :

١- قەرزی عەینی ( پەیوەستە بە میراتەکە )   ٢- قەرزی کەسی ( پەیوەستە بە خودی مردووەکە )

**ئینجا ئەم قەرزانەی سەرەوە باس کرا بە هەموو بەشەکانەوە دەکرێتە دوو بەش :-**

**١- قەرز لە کاتی لەش ساغی .**

**٢- قەرز لەکاتی نەخۆشی .**

**جا ئەگەر هاتوو میراتەکە پاش دەرکردنی مەسرەفی ئامادەکاری مردووەکە بەشی هەموو قەرزەکانی کرد ئەوا دەبی هەمووی بدرێتەوە قەرز بەلام ئەگەر بەشی نەکرد ئایا کامیان لەم قەرزانە پیش دەدریتەوە ئەوەش رای جیاوازی زانایانی لەسەرە .**

**<u>قەرزی خوا:-</u> قەرزێکە پەیوەستە بە مافی خوای تعالی وهیچ مافی ئادەمیزادی بەسەرەوە نیە دوابکرێ وەکو زەکات و کەفارەو نەزر ، ئەبو حەنیفە فەرمویەتی ئەو قەرزە لە میرات میرات نادری تەنها ئەگەر مردووەکە وەسیەتی کردبێ لەو کاتەی وەسیەتەکەی جێ بەجێ دەکری لە سنوری سێیەکی میرات پاش دانەوەی قەرزی بەندە ، بەلام بەلای جمهوری زانایان واجبە دانەوەی قەرزەکانی خوا وە دەرکردنی لە میرات دەبێ پیش بەش کردنی میرات .**

**<u>قەرزی ئادەمیزارد:-</u> قەرزێکە مافی ئادەمیرزادە داوای لی دەکرێ بیداتەوە ئەمەش دەکرێ بە دوو بەشەوە :-**

**١- قەرزی عەینی ( پەیوەست بە میراتەکە) وەکو نرخی شتێك کە کریویەتی نەیداوە وە یان مارەیی دیاری کردوە بۆ هاوسەرەکەی و نەیداوە و مرد ئەوا ئەم قەرزانە پیش قەرزەکانی ترن.**

**٢- قەرزی کەسی ( پەیوەست بە خودی مردوەکە ) ئەو قەرزانە دەگریتەوە کە پەیوەندی بە مردوەکە هەیە نەوەك میرات ئەمەشیان دەکرێ بە دوو بەشەوە :-**

**١- قەرز لە کاتی لەش ساغی .**

**٢- قەرز لەکاتی نەخۆشی سەرەمەرگ یان مردن.**

**قەرزی سەرەمەرگ یان نەخۆشی مردن جێگیر نابێ تەنها بە دان پێدانانی نەخۆشەکە لە نەخۆشی مردن جگە لەمە قەرزی لەش ساغی و تەندروستیە جا هیچ جیاوازیەکی نیە جێگیر بوبی لە حالی تەندروستی یاننەخۆشی کەواتە گشت قەرزەکان دەگریتەوە وە بەبەلگە بی یان نا بە دان پێدانان بی یان بە انکاری سوێند خواردن بی لە کاتی ساغی هەروەها ئەو قەرزانەی جێگیر بووە لە کاتی نەخۆشی بەهەبونی بەلگەی قەتعی وەکو قەرزی پارەی دەرمان و پارەی دکتۆر بۆیە قەرزی ساغی پیش قەرزی نەخۆشی دەکەوێ.**

## ﴿ مافی سێیەم // وەسیەتی مردووەکە ﴾

**پێناسەی وەسیەت و بەشەکانی :–**

**وەسیەت لە رووی شەرعەوە بریتی یە لە کردنە مولك پاش مردنی وەسیەتکارەکە بەرێگای بەخشین – تبرع – . بەلگەی وەسیەت خوای تعالی دەفەرموێ ﴿ من بعد وصية يوصى بها او دين ﴾ وە فەرموودەی پێغەمبەرمان صلى الله عليه وسلم ( إن الله تصدق عليكم بثلث أموالكم في آخر أعماركم زيادة في أعمالكم فضعوه حيث شئتم ) وە لەبەر ئەوەی جمهوری زانایان پێیان وایە کە وەسیەت سونەتە واتە کەسێك بۆی هەیە وەسیەت بکا و بۆی هەیە نەیکات جا ئەگەر وەسیەتی کرد لەسەری واجب نابێ واتە بۆی هەیە پەشیمان بێتەوە پێش مردنی بەلام ئەگەر پەشیمان نەبۆوە لە وەسیەتەکەی تا مرد ئەوا واجبە لەسەر میراتگرەکانی جێ بە جێی بکەن بەگوێرەی پێویست ، پاشان وەسیەت جاری واهەیە بۆ میراتگرە و جاری واهەیە بۆ غەیری میراتگر دەبێ کەواتە بوە دووحالەت :–**

- **ئەگەر وەسیەت بۆ میراتگر نەبێ : ئەوا وەسیەتەکە جێ بەجێ دەکرێ لە سنوری سێیەکی ماوە لە میرات پاش دانەوەی ئەو مافانەی کە پێشتر ئاماژەمان بۆی کردووە جا ئەگەر وەسیەتەکە زیاتر بوو لە سێیەکی میرات ئەوا زیادەکە جێ بەجێ ناکری تەنها بە ئیجازەو رێگە پێدانی میراتگرەکان واتە ئەگەر مۆلەتیان نەدا و رازی نەبوون ئەوا لە سێیەك زیاتر جی بەجێ ناکرێ .**
- **ئەگەر وەسیەت بۆ میراتگر بێ: جێ بەجێ ناکرێ تەنها بە مۆلەتی میراتگرەکان جا لەسنوری سێیەك بێ یان زیاتر بێ لە سێیەك .**

**جا ئەگەر هاتوو وەسیەتەکان جۆراو جۆر بوون و سێیەکی میراتەکەش بەشی هەموو وەسیەتەکانی نەدەکرد ئەوا هەمووی جێ بە جێ دەکرێ و هیچ کێشەی تێدا نیە بەلام ئەگەر لە سێیەك زیاتر بوون ئەوا بەرێژەی خاوەن وەسیەت بەسەر کراوەکان دابەش دەکریت . وە بەلای هەندی لە زانایان وەسیەت واجبە بۆ هەندێ لە خزمان ئەگەر مرد بەبێ وەسیەت کردن بۆ هەندێ خزمان ئەوا لە سامانەکەی ئەندازەیەك دیاری دەکرێت بۆ خزمان ئەوەیە کەپێی دەگوترێ وەسیەتی واجبە بۆ ئەو نەوانەی کە باوکیان یان دایکیان مردوە پیش خاوەن میرات ئەم وەسیەتە واجبە پیش وەسیەتی سونەت دەکەوێ هەروەك لە شوینی خۆی باسی دەکەین ان شاءالله .**

**پرسیار :– ئەگەر قەرز پیش وەسیەت بێ لەبەرچی لە قورئان وەسیەت پیش قەرز باس کراوە ﴿ من بعد وصية يوصى بها او دين﴾؟**

**ئیمامی ئەحمەد و تورمذی وابن ماجە و ئەصحابی تەفسیر دەگێرنەوە لە پێشەوا عەلی رەزای خوای لەسەربێ فەرمویەتی ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێننەوە ( من بعد وصيه ...) کە وەسیەت پێش قەرزە کەچی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم قەرزی پیش وەسیەت جێ بە جێ کردوە ، ئیمام فخر الدين الرازی لە تەفسیری ئەم ئایەتە دەفەرموێ: بزانە حیکمەت لە پیش خستنی وەسیەت لەسەر قەرز لەرووی لەفزەوە لە دوو روانە :**

- یەکەم : وەسیەت مالێکە بێ بەرامبەر وەردەگیرێ بۆیە دەرکردنی و جی بەجێ کردنی لەلایەن میراتگرەکانەوە تۆزێ قورسەو لەوانەیە لاملی بکەن و و هەندی جاریش کەم تەرخەمی لی بکەن یان هەر نەیدەن ، بەلام قەرز وانیە هەر میراتگرەکان لەناخەوە حەز بەدانەوەی دەکەن بۆیە خوای تعالی وەسیەتی پیش قەرز خستوە تاوەکو هاندانێك بێت بۆ دەرکردنی وەسیەتەکە پاشان بۆ زیاتر هاندان لە ئایەتەکە ووشەی – او – لە نیوان وەسیەت و قەرز داناوە وەکو ئاگاداریەك کەوا هەردوکیان هەمان حوکمی واجبیان هەیە وەکو یەك .
- دووەم : چۆن بەشەکانی میرات دوای دانەوەی قەرزە ئەوهاش دەکەویتە دوای وەسیەت چونکە ئەگەر مردووەکە وەسیەتی بە سێیەکی مالی کردبێ ئەوا اعتبار بەبەشی میراتگر ناکرێ هەتا وەسیەتەکە نەدرێ بۆ وەسیەت بۆ کراو هەروەکو قەرز ، بەلکو جیاوازی هەیە لە نیوان قەرزو وەسیەت لەلایەکی ترەوە ئەویش ئەوەیە ئەگەر کەسێك مردوو میراتی هەبوو هەندێ لە میراتەکە فەوتا ئەوا کەم و کوری دەکەوێتە بەشی وەسیەت بۆ کراوان واتە قەرز کورتی ناکەوتێ واتە ئەگەر میراتەکە هەندێکی لێ فەوتا تەنها ئەوەندە مابوو هەموو قەرزەکەی پێ بدرێتەوە ئەوا دەدرێتەوە قەرزو مافی وەسیەت بۆ کراو ومیراتگران دەفەوتێ.

کەواتە بۆمان دەرکەوت کە وەسیەت لە روێکەوە بەمیرات دەچێ و لە روێکی ترەوە بەقەرز هەروەك کەمیك پیش ئیستا باسمان لێوە کرد کە فەوتانی میرات کاردەکاتە سەربەشی وەسیەت بۆ کراو میراتگران نەوەك بۆ سەر قەرز وە لە رووی پێچونی بە بەشی میراتگران اعتباری بۆ ناکری تاوەکو وەسیەت دەدرێ هەروەها پاش قەرزیش اعتباری بەشی میراتگران دەکرێ والله اعلم.

## ﴿ مافی چوارەم// میرات ﴾

مافی چوارەمین لە پاش جی بەجی کردنی سیّ مافەکەی رابردوو ماوە بەسەر میراتگران دابەش دەکریّ و بەگوێرەی شەرع کە دیاری کردووە کە ئەمەش بابەتی سەرەکی ئێمەیە .

**هۆکارەکانی میرات:–** مافی وەرگرتنی میرات یان بوون بە میراتگر سیّ هۆکارە :

١. گرێبەستی هاوسەرگیری شەرعی .
٢. خزمایەتی راستەقینە .
٣. الولاء.

**١– گرێبەستی هاوسەرگیری شەرعی :–**

بریتی یە لە هاوسەرگیری شەرعی دروست ئەگەر تەنها بە گرێبەستیش بێت واتە ئەگەر خەلوەو سەرجیّ بوونیش نەبوو بەلام بە گرێبەستی فاسد میراتگرتن نیە مەبەست لە فاسد ئەوەیە کە مەرجێك لەمەرجەکانی نەهاتوتە دی وەکو شاهێد ، هەروەها نیکاحی باطل بەهەمان شیوە میراتی تیدا نیە وەکو نیکاحی موتعە .

وە مەرجی ژن ومێردایەتی ئەوە لەکاتی مردنی مردوەکە بەردەوامی هەبی جا بە حەقیقەت واتە نەزانراوە تەلاق درابن ، یان حکما واتە ژنەکە تەلاق دراوە بەلام کە هاوسەرە تەلاق دەرەکە مردوە لەناو عیدەی تەلاقی رجعی مردوە هەروەها لە تەلاقێکی بائن ئەگەر میردەکە تەلاقی دابی بەنیزی زرەردان لە ژنەکە واتە بۆیە تەلاقی داوە تا نەبیتە میراتگر بۆنمونە لە نەخۆشی سەرەمەرگدایە سیّ بە سیّ خیرانەکەی تەلاق دەدات بەبیّ ئەوەی ژنەکە داوای تەلاقی کردبیّ ئەوا لەو حالەتەدا ئەو ژنە ئەگەر بائنەش بیّ هەر میراتگرەو مافی میراتگرتنی هەیە ئەگەر لەناو عیدە دابی ، بەلام ئەگەر ژنە تەلاق دراوەکەی باسمان کرد بائنە لەناو عیدە پیش مێردە تەلاق دەرەکە مرد ئەوا میردەکە میراتگر نیە و میراتی لی ناگری چونکە پیاوەکە بەهۆی تەلاقەکە مافی خۆی فەوتاندوە ، وە ئەگەر هاتوو ژنەکە مرد لە عیدەی تەلاقی رجعی وە هۆی جودابونەوەکە ژنەکەیە و ژنەکەش لە نەخۆشی سەرەمەرگ دایە وەکو هەلگەرانەوەی لە ئیسلام یان کارێکی وای کرد بوە هۆکاری جودابونەوە ئەوا پیاوەکە میراتی لی دەگریّ .

وە بەلگەی میراتی ژن و مێرد دیارە کە لە قورئانی پیرۆز لە سورەتی النساء ئایەتی ١١ بە دریژی باس کراوە بۆیە بوون بە خاوەن بەشی دیاری کراو .

**٢- خزمایەتی راستەقینە:-**

مەبەست پەیوەندی بونە بە نەسەبە کە ئەمانە دەگرێتەوە ﴿ داك - باب - کور - کچ - خوشك - برا - مام ..﴾ ، ئینجا بزانە میراتی بە نەسەبە دەکریٚ بە سیٚ جۆرەوە :-

- خاوەن بەشی دیاری کراو
- عصبە
- ذوو الارحام

**٣- الولاء :-**

بریتی یە لە خزمایەتیەکی پەیدابوو بەهۆی ئازادکردن و رزگارکردن لە کۆیلایەتی کە بەعەرەبی پێی دەگوترێ {ولاء العتق }یان { ولاء النعمه } هۆکارەکەی بریتی یە لە نیعمەت لەگەل کردنی ئازادکارەکە لەبەرامبەر کۆیلەکراوەکە واتە ئەگەر گەورەی کۆیلەکە یان کەنیزەکە ئازادی کرد ئەوا ئازادکراوەکە بمریٚ و میراتگری نەبی ئەوا دەبن بە میراتگری یەکتر لەگەل سید و گەورەکەی ، وە لەبەرئەوەی لەم سەردەمە نەماوە بۆیە دریژە بەو باسە نادەین.

**مەرجەکانی میرات :-**

مەرجی جیٚگیر بونی میرات دووشتە :

- یەکەم :- مردنی حەقیقی یان مردنی حوکمی مردوەکە :- واتە ئەوکەسەی میراتەکەی بەش دەکریٚ هەتا خۆی لە ژیان ماوە کەس مافی ئەوەی نیە داوای میراتی لیٚ بکات واتە مولکی خۆیەتی و ئەو مولکە کە هەیەتی ناگوازریٚتەوە بۆ میراتگران تەنها لە ریٚگای مردنی خاوەنەکەی چا بە حەقیقی مردبی یان مردنیٚکی حوکمی بیٚت ، مەبەست لە مردنی حەقیقی واتە دەرچونی روحە و گیان سپاردنە کە گومانی تیدا نیە و بینراوە کە مردوە، وە مردنی حوکمی وەکە مفقود و نادیار ئەمەش پەیوەستە بە بریاری دادگا واتە قازی بریاری مان و نەمانی بۆ دەردەکات واتە نابیٚ میراتەکەی بەش بکری تا بەیەقینی دەزانریٚ مردووە وە یان بریاری دادگا و حوکمی قازی بریاری لەسەرداوە کە مردوە و لەژیان نەماوە .
- دووەم:- ژیانی میراتگر لەکاتی مردنی خاوەن میرات : واتە دەبی یەقین هەبی کە میرات گر لەکاتی مردنی خاوەن میرات ژیانی هەبوەو لە ژیان ماوە گەر ب چرکەیەکیش بیت تا ببی بەشایەنی میراتەکە ، بۆیە ئەگەرهاتوو دوو میراتگر یان زیاتر بەیەکەوە مردن لەیەك کات و سات دا و نەزانرا کامیان پیش ئەوەی تر مردوە ئەوە نابن بە میراتگری یەکتر بۆ نمونە باب و کوریك یان دوبرا یەیەکەوە مردن بەروداویك و نەزانرا کامیان پیٚش ئەوەی تر مردوە نابن بە میراتگری یەکتر بەلکو میراتی هەریەکەیان بۆ میراتگرە زیندوەکانی خۆی دەبیٚ .

## ڕێگرو بەربەستەکانی میرات :-

مەبەست ئەوەیە میراتگر مەرجەکانی میراتگری لیَ هاتۆتە دی و شایەنی ئەوەیە ببیَ بە میراتگر بەلام هەندیَ بەربەست هەیە دیَتە پیش میراتگر بەهۆیەوە بیَبەش دەبیَ لە میرات ئەم بەربەستانەش ئەمانەن کە ئیتیفاقی زانایانی لەسەرە:-

- کۆیلایەتی
- کوشتن
- جیاوازی ئاین

لەبەر ئەوەی کۆیلایەتی لەم سەردەمە نیە بۆیە باسی ناکەین وەك پیَشتر ئاماژەمان پیَ کرد.

کوشتن:- یەکیَ لە مەقچەدەکانی شەریعەتی ئیسلام ئەوەیە ئەگەر یەکیَك پەلە بکات لە شتیَك پیش کاتی خۆی ئەوا سزادەدری بە بیَبەش بونی لە شتەکە کە پەلەی لی کردوە و پیش کاتی خۆی خستوە هەر بۆیە بۆ میراتگرەی کە خاوەن میرات دەکوژی بیَبەش دەبی لە میراتەکە هەروەك پیَغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرمویەتی ( لیس لقاتل شیئ) ، ئەمە اتفاقی زانایانی لەسەر کە بکوژ میرات ناگری لە خاوەن میراتە کوژراوەکە بەیەك دەنگی زانایان بەلام رای جیاوازی زانایان لەسەر ئەوەیە چ جۆرە کوشتنیك هۆکارە بۆ بیَبەش بون لە میرات ؟

- مەزهەبی ئەبو حەنیفە:- ئەو کوشتنە ڕێگرە لە میرات : کوشتنی بە ئەنقەست - عمد - هەروەها شبە عند ، وە کوشتنی بەهەلە وە ئەوەی بەهەلە شوبهیَندراوە .
- مەزهەبی مالیکی:- تەنها کوشتنی بە ئەنقەست - عند -
- مەزهەبی حەنبەلی :- هەر کوشتنیَك کە تۆلە و دیە و کەفارەی بۆ دانرابیَ .
- مەزهەبی شافعی :- کوشتن بە هەموو جۆرەکانیەوە هەروەها بە شاهیدی دان لە پیناوی بکوژ و پلپشتی کردنی بکوژ و پاکانە کردن بۆ شاهیدی بکوژ وە ببیَتە هۆکار بۆ کوژرانی خاوەن میرات وەکوشاهیدی دانی بکوژەکە لەسەر کەسیك کە میراتی لی دەگری بە ئەنجامدانی زیناکردن و کە ژنی هەبوەو زینای کردوە و کەسەکە رەجم کرا ئەوا لەم حالەتەش میرات نابات.

جیاوازی ئایین:-

ئەم بەربەستەش کۆ دەنگی زانایانی لەسەرە بە بریاری پیَغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرمویەتی { لایرث المسلم الکافر ولا الکافر المسلم } کافرو موسلمان نابن بە میراتگری یەکتری ، چونکە میرات بریتی یە لە هاوکاری کردن و یارمەتی دان وە جیَنشینی میراتگرە لە شویَن مردووەکە ئەوکارانەش لە نیوان موسلمان و کافر نیە ، هەروەها لەبەر ئەوەی کوفر بە تیَکرایی و ناو و جۆر یەك میللەتن ئەوان دەبن بە میراتگری یەکتری .

**ميراتی هەلگەراوە لە ئیسلام- مرتد - :-** مرتد بەو كەسە دەگوترێ كە لە ئیسلام دەرچوە بە ویست و هەلبژاردنی خۆی وە كۆی زانایان لەسەر ئەوەیە كە مرتد میرات لە موسلمان ناگرێ بەلام ئایا موسلمان لە مرتد دەگرێ؟ جمهوری زانایان لەسەئەوەن كە موسلمان میرات ناگرێ لە مرتد بەلكو مولكەكەی دەبی بە مولكی گشتی بۆ موسلمانان سەرف دەكرێ بەلام بەلای مەزهەبی ئەحنافەكان مولك و میراتی مرتد بۆ میراتگرەكانی موسلمان دەبێت.

**ریزبەندی میراتگران بەپێی شایەن بون بۆ میراتە :-**

میرات بە گشتی دەكریت بە چواربەش:-

- بە فەرز - بەشی دیاری كراو -
- بە تعصیب { كە دوو جۆری هەیە نەسەب و سبب }
- بە رەت كردنەوە { دوو جۆری هەیە : بە نەسەب و بەسەبەب }
- خاوەن رەحم {ذوو الارحام }

ئەمانەش هەمویان لەیەك ئاست دا نین بەلكو پلەیان جودایە هەندێك پێش ئەوەی تر دەكەوێ وە ئەگەر بەیەك كۆببنەوە هەتا ئاستە نزیكەكە هەبی دورەكە نایبات . بەم شێوەیەی خوارەوە :-

- خاوەن بەش
- عصبە بە نفس
- رەت كردنەوە بۆسەر خاوەن بەشەكانی بە نەسەب جگە لە باب و باپیر .
- خاوەن رەحم { ذوو الارحام }
- رەد بۆ ژن و مێرد .
- عصبە بە سبب .

ئەگەر هاتوو لەو شەش ئاستەی كە باسمان كرد مردوەكە كەسی نەبی ئەوا میراتە كە بەبی ناوی میرات بۆیەك لەم چینانەی خوارەوە دەبێ :-

- كەسێك مردوەكە دانی ناوە بە خزمایەتی بۆی واتە بە اعتراف .
- كەسێك مردوەكە وەسیەتی بۆ كردوە بە زیاتر لە سێیەكی ماوە .
- بۆ مافی گشتی - دەولەت - دەگەریتەوە .

ئەمانەی باسمان كرد بە كورتی بوو ان شاءالله بە درێژی باسیان دەكەین .

# ﴿ خاوەن بەشەکان ﴾

**خاوەن بەشی دیاری کراو:–** هەر میراتگرێکەبەشێکی دیاری کراوی هەیە کە لە قورئان ناوی بەشەکە هاتووە وەکو مێرد، کچ، خوشك ، وە یان لە سوونەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلمناوی هاتوە وەکو داپیر ، وە یان بە اجماع هاتوە وەکو باپیر لە جێگای باب وە کچی کور لە جێگای کچ.

**ژمارەی خاوەن بەشەکان:–** ژمارەیان دوازدەیە :

- چواریان لە نێرینەکانن : باب – باپیری صحیح هەتا سەرکەوی – برا لە داك – مێرد.
- هەشتیان لە مێینەکانن :– ژن – کچ – خوشك لە داك وباب – خوشك لەباب – خوشك لە داك – داك – کچی کور – داپیری صحیح هەتا سەرکەوێ .

**بەشە دیاری کراوەکان لە قورئانی پیرۆز :–** تەنها شەش بەش ناوی هاتوە لە قورئان :–

١– نیوە ٢\١    ٢– چواریەك ٤\١    ٣– هەشت یەك ٨\١    ٤– دوو سێیەك ٣\٢

٥– سێ یەك ٣\١    ٦– شەش یەك ٦\١

==============================================



## { یەكەم// میراتی داك وباب }

ئەصل لـه میراتی باب و داكی مردوەكە ئایەتی ژمارە ١١ سورەتی النساء

﴿ ولأبويه لكل واحد منهما السدس مما ترك ان كان له ولد فان لم يكن له ولد وورثه ابواه فلأمه الثلث فان كان له اخوة فلأمه السدس ﴾

**حالـەتەكانی داك وباب :-**

- ■ حالـەتی یەكەم:- هەبونی داك وباب و منالی مردوەكە لـه مەسئەلـەدا:-
  - ○ ئەگەر منالـەكەی مردووەكە ( كور یان كوری كور ) بیت واتە نێر بێت ئەوا هەریەك لـەداك وباب شەش یەكی میراتیان هەیە و زیاتر نیە ئەویش بە فەرز و ماوە بۆ منالی مردوەكە دەبیت بە تعصیب .
  - ○ ئەگەر منالی مردووەكە (كچ یان كچی كور ) بوو واتە تەنها مێینەی هەبوو ئەوا داك وباب شەش یەكی خۆیان دەبەن و وكچ یان كچی كور بەشی خۆی دەبات ئەگەر ماوە ماوە ئەوا بۆ بابەكە دەگەرێندرێتەوە بە تعصیب .

نمونە : ژنێك مردوە لـەپاشی بەجێماوە ( مێرد – كچ – باب )

| میراتگر | بەش | مەسئەلـە |
|---|---|---|
| | | ١٢ |
| مێرد | ٤\١ | ١٢÷٤=٣ |
| كچ | ٢\١ | ١٢÷٢=٦ |
| باب | ٦\١ ع | ١٢÷٦=٢<br>٢+١=٣ |

شی كردنەوە :-

١- مێردەكە ٤\١ چونكە فەرعی میراتگر هەیە كە كچی مردوەكەیە

٢- كچەكە ٢\١ هەیە چونكە تەنهایە و عصبەی نیە .

٣- باب ٦\١ هەیە بە فەرز وماوە دەبات بە عصبە چونكە فەرعی نێرینە نیە .

**٤- ئەصلی مەسئەلە لە ١٢ چونكە چواریەك و شەش یەك هەبە .**

**٥- دیاری كردنی بەشەكان : ئەصلی مەسئەلە دابەشی سەربەشەكان بكە : بەشی میرد ١٢÷٤=٣ سهم ، بەشی كچ ١٢÷٢=٦ سهم ، بەشی باب ١٢÷٦=٢ سهم ماوە ١سهم بۆ بابەكە ٢+١=٣ سهم .**

- ■ **حالـەتی دووەم : لـە مەسەلـەدا تەنها باب و داك هەیەو منال نیە ئەوا لـەم حالـەتە دایكەكە سێیەكی خۆی دەبات و ماوە بۆ باب بە عصبە دەبیٚ .**
- ■ **حالـەتی سێیەم :- دوو مەسئەلـەی ناوداری غراوتین یان عومەریەتەین واتە ﴿ ژن –داك – باب ﴾ وە ﴿ میرد – داك – باب ﴾ ئەوا سێیەكی ماوە بۆ داك دەبی لـە دوای بەشی ژن و میرد :-**

| میراتگر | بەش | مەسئەلـە |
|---|---|---|
| | | ٦ |
| مێرد | ٢\١ | ٦÷٢=٣ |
| داك | ٣\١ی ماوە | ٣÷٣=١ |
| باب | ماوە بە ع | ٢ |

**شی كردنەوە :-**

**١- میردەكە نیوەی هەیە چونكە فەرعی میراتگر نیە**

**٢- داك سێیەكی ماوە .**

**٣- باب ماوە بە ع .**

**٤- ئەصلی مەسئەلە لە ٦ چونكە نیوەو سێیەك هەیە .یان دەتوانین بلیین لـە ٢ ئەصلی مەسئەلـەی میرد پاشان بە تصحیح دەبی بە ٦**

**٥- دیاری كردنی بەشەكان : بەشی مێرد ٦÷٢= ٣ سهم ، وە ٣ سهم بۆ دایەكەكە سێیەكی ٣ واتە ٣÷٣= ١سهم و ماوە ٢سهم بۆ بابەكە .**

| میراتگر | بەش | مەسئەلـە |
|---|---|---|
| | | ٤ |
| ژن | ٤\١ | ٤÷٤=١ |
| داك | ٣\١ی ماوە | ٣÷٣=١ |
| باب | ماوە بە ع | ٢ |

شی کردنەوە :-

١- ژنەکە چواریەکی هەیە چونکە فەرعی میراتگر نیە

٢- داك سێیەکی ماوە .

٣- باب ماوە بە ع .

٤- ئەصلی مەسئەلە لە ٤ لە مەسئەلەی ژن

٥- دیاری کردنی بەشەکان : بەشی ژن ٤÷٤= ١ سهم ، وە ٣ سهم بۆ دایەکەکە سێیەکی ٣ واتە ٣÷٣= ١سهم و ماوە ٢سهم بۆ بابەکە .

■ حالەتی چوارەم :- ئەگەر لەمەسەلەی داك وباب خوشك وبرای مردوەکە هەبی جا لەهەرکامیان بێت (داك وبابی ، بابی ، داکی ) لەم حالەتەدا دووحوکی تێدایە:-

- خوشك وبراکان بیبەش دەبن لە میرات بەباب.
- ئەگەر ژمارەیان لە یەك زیاتر بی هەرچەندە بیبەشیش دەبن بەلام داکی مردوەکە لە سێیەك دەکەن بە شەش یەك.

نمونە ١:- پیاوێك مردوە لەپاشی بەجێماوە ﴿ ژن - داك - باب - کور - خوشك لە داك وباب ﴾

| میراتگر | بەش | مەسئەلە |
|---|---|---|
| | | ٢٤ |
| ژن | ٨\١ | ٢٤÷٨=٣ |
| داك | ٦\١ | ٢٤÷٦=٤ |
| باب | ٦\١ | ٢٤÷٦=٤ |
| کور | ماوە | ٢٤-١١=١٣ |
| خوشك لە د.ب | - | - |

شیکردنەوە :-

١- ژنەکە ٨\١ میرات چونکە فەرعی میراتگر هەیە - کور -

٢- داك ٦\١ میرات چونکە فەرعی میراتگر هەیە - کور -

٣- باب ٦\١ میرات چونکە فەرعی میراتگر هەیە - کور -

٤- ماوه بۆ كور به عصبه به نفس

٥- خوشكه‌كه بيبه‌شه به باب و كور .

٦- ئه‌صلى مه‌سئه‌له له ٢٤ له‌به‌ر هه‌بونى ٨\١ و ٦\١ نيوه‌ى يه‌كيان جارانى ته‌واوى ئه‌وه‌ى تر ٤×٦=٢٤

٧- ديارى كردنى به‌شه‌كان : به‌شى ژن ٢٤÷٨=٣ ،به‌شى داك ٢٤÷٦=٤ به‌شى باب ٢٤÷٦=٤ ،به‌شى كور ماوه ٢٤-١١=١٣

نمونه٢:- كه‌سێك مردووه له‌پاشى به‌جێماوه ﴿ باب –داك = كچ – برا له داك ﴾

| ميراتگر | به‌ش | مه‌سئه‌له |
|---|---|---|
| | | ٦ |
| داك | ٦\١ | ٦÷٦=١ |
| باب | ٦\١ ع | ٦÷٦=١+١=٢ |
| كچ | ٢\١ | ٦÷٢=٣ |
| برا له داك | – | – |

شيكردنه‌وه :-

١- داك ٦\١ ميرات چونكه فه‌رعى ميراتگر هه‌يه – كچ –

٣- باب ٦\١ و ماوه به عصبه‌ميرات چونكه فه‌رعى ميراتگر هه‌يه – كچ –

٤- كچه‌كه٢\١ ميرات چونكه ته‌نهايه‌و عصبه‌ى نيه

٥- براكه‌ى له‌داك بيبه‌شه به باب و كچ

٦- ئه‌صلى مه‌سئه‌له له ٦ له‌به‌ر هه‌بونى ٦\١ و نيوه‌و ماوه .

٧- ديارى كردنى به‌شه‌كان : به‌شى داك ٦÷٦=١ به‌شى باب ٦÷٦=١ هه‌روه‌ها ماوه ١ به عصبه واته ٢ ،به‌شى كچ ٦÷٢=٣

نمونه ٣:- کەسێك مردوە لەپاشی بەجێماوە ﴿ باب – داك – ٢برا لە داك وباب ﴾

| میراتگر | بەش | مەسئەلە |
| --- | --- | --- |
| | | ٦ |
| داك | ٦\١ | ٦÷٦=١ |
| باب | ماوە | ٦-١=٥ |
| ٢برا لە داك وباب | - | - |

شیکردنەوە :-

١- داك ٦\١ میرات چونکە ٢ برا لەداك وباب هەیە

٣- باب ماوە بە عصبە میرات چونکە فەرعی میراتگر نیە

٤- ٢براکەی لەداك وباب بیبەشە بە باب

٥- ئەصلی مەسئەلە لە ٦ لەبەر هەبونی ٦\١ و ماوە .

٦- دیاری کردنی بەشەکان : بەشی داك ٦÷٦=١ بەشی باب ماوە ٦-١=٥ ،٢ برا لە داك وباب بیبەشن بە باب

نمونە ٤ :- پیاوێك مردوە لە پاشی بەجێماوە ﴿ ژن – داك – برا لەداك – برا لە داك وباب ﴾

| میراتگر | بەش | مەسئەلە |
| --- | --- | --- |
| | | ١٢ |
| ژن | ٤\١ | ١٢÷٤=٣ |
| داك | ٦\١ | ١٢÷٦=٢ |
| برا لە داك | ٦\١ | ١٢÷٦=٢ |
| برا لە د.ب | ماوە | ٥ |

شیکردنەوە :-

١- ژنەکە ٤\١ میرات چونکە فەرعی میراتگر نیە

٢- داك ٦\١ میرات چونکە فەرعی میراتگر نیە بەلام ٢ برا هەیە

٣- برا لە داك ٦\١ چونکە تەنهایەو ریگری نیە

٤- ماوە بۆ برا لە داك وباب بە عصبە بە نفس

٥- ئەصلی مەسئەلە لە ١٢ لەبەر هەبونی ١\٤ و ١\٦ نیوەی یەكیان جارانی تەواوی ئەوەی تر ٢×٦=١٢

٦- دیاری كردنی بەشەكان : بەشی ژن ١٢÷٤=٣ ،بەشی داك ١٢÷٦=٢ بەشی برا لە داك ١٢÷٦=٢ ،بەشی برا لە داك وباب ماوە ١٢-٧=٥ .

=============================================================

## ﴿ دووەم // میراتی ژن و مێرد ﴾

ئەصل لە بونی ژن و مێرد ە میراتگر ئایەتی ١٢ لە سورەتی النساء :-

﴿ ولكم نصف ما ترك ازواجكم ان لم يكن لهن ولد فان كان لهن ولدفلكم الربع مما تركن من بعد وصية يوصين بها او دين ولهن الربع مما تركتم ان لم يكن لكم ولد فان كان لكم ولد فلهن الثمن مما تركتم ........ ﴾

كەواتە لە دەقی ئەم ئایەتە بۆمان ڕۆن بۆوە كەوا هەریەك لە ژن و مێرد دوو حالـەتیان هەیە : مێرد ﴿ نیوەو چواریەك ﴾ وە ژن ﴿ چواریەك و هەشت یەك ﴾

- ■ حالـەتەكانی مێرد :-
  - ○ حالـەتی یەكەم : نیوەی میرات : ئەگەر هاتوو ژنە مردوەكە منال و نەوەی میراتگری نەبێ چ لەو مێردە یان لەمێردێكی تر هەروەها ئەگەر منال و نەوەی هەبی بەلام میراتگر نەبن بۆ نمونە بكوژی مردوەكەیە یان ناموسلمانە یان كۆیلـەیە ئەوا مێردەكە هەر نیوە دەبات .
  - ○ حالـەتی دووەم:- چواریەكی میرات : ئەگەر ژنە مردووەكە منال یان نەوەی میراتگری هەبێ لەو مێردە بێ یان لە مێردێكی تر .

نمونە لەسەر دوو حالـەتەكانی مێرد:-

١- ژنێك مردوە لەپاشی بەجێماوە ﴿ مێرد – داك – برا لەداك ﴾

| میراتگر | بەش | مەسئەلە |
|---|---|---|
| | | ٦ |
| مێرد | ١\٢ | ٦÷٢=٣ |
| داك | ١\٣ | ٦÷٣=٢ |
| برا لە داك | ١\٦ | ٦÷٦=١ |

شی كردنەوە :-

**١– مێرد نیوەی میراتە چونکە منال و نەوە نیە**

**٢– داك : سێیەکی میراتە چونکە منال و نەوە و ژمارەی خوشك و برا نیە.**

**٣– برا لەداك: شەش یەکی هەیە چونکە یەکەو مردوەکە منال و نەوەو باب و باپیری نیە.**

**٤– ئەصلی مەسئەلە لە ٦ چونکە شەش یەك و سێیەك تداخلن گەورەکە وەردەگرین کە ٦**

**٥– دیاری کردنی بەشەکان بریتی یە لە دابەش کردنی ئەصلی مەسئەلە بەسەر سەهمەکان :مێرد ٦÷٢=٣ ، داك ٦÷٣=٢ ، برا لە داك ٦÷٦=١ .**

**٢– ژنێك مردووە لەپاشی بەجێماوە : مێرد – کچ – کور**

| میراتگر | بەش | مەسئەلە |
|---|---|---|
| | | ٤ |
| مێرد | ٤\١ | ٤÷٤=١ |
| کور | ماوە بە تعصیب | ٢ |
| کچ | | ١ |

**شی کردنەوە :**

**١– مێرد چواریەکی هەیە چونکە ژنە مردوەکە منالی میراتگری هەیە.**

**٢– ماوە بۆ کورو کچەکە بە تعصیب واتە للذکر مثل حظ الانثیین دووبەشی کور بەشێکی کچ**

**٣– ئەصلی مەسئەلە لە ٤ چونکە چواریەك و ماوە هەیە .**

**٤– دیاری کردنی بەشەکان : بریتی یە لە دابەش کردنی ئەصلی مەسئەلە بەسەر سەهمەکان : مێرد ٤÷٤=١ سهم و ماوە بۆ کورو کچەکە ٣سهم واتە ٢سهم بۆ کور و ١سهم بۆ کچەکە .**

٣- ژنێك مردوه لەپاشی بەجێماوە : مێرد - باب - داك - كور

| میراتگر | بەش | مەسئەلە |
| --- | --- | --- |
| | | ١٢ |
| مێرد | ٤\١ | ١٢÷٤=٣ |
| داك | ٦\١ | ١٢÷٦=٢ |
| باب | ٦\١ | ١٢÷٦=٢ |
| كور | ماوە | ١٢-٧=٥ |

شیكردنەوە :-

١- مێردەكە ٤\١ میرات چونكە فەرعی میراتگر هەیە - كور -

٢- داك ٦\١ میرات چونكە فەرعی میراتگر هەیە - كور -

٣- باب ٦\١ میرات چونكە فەرعی میراتگر هەیە - كور -

٤- ماوە بۆ كور بە عصبە بە نفس

٥- ئەصلی مەسئەلە لە ١٢ لەبەر هەبونی ٤\١ و ٦\١ نیوەی یەكیان جارانی تەواوی ئەوەی تر ٤×٣=١٢

٦- دیاری كردنی بەشەكان : بەشی میرد ١٢÷٤=٣ ،بەشی داك ١٢÷٦=٢ بەشی باب ١٢÷٦=٢ ،بەشی كور ماوە ١٢-٧=٥

نمونە ٤ : ژنێك كوژراوە لەپاشی بە جێماوە : مێرد - كور بكوژ - داك - برا لەداك وباب

| میراتگر | بەش | مەسئەلە |
| --- | --- | --- |
| | | ٦ |
| مێرد | ٢\١ | ٦÷٢=٣ |
| داك | ٣\١ | ٦÷٣=٢ |
| كور بكوژ | - | - |
| برا لە د.ب | ماوە | ٦-٥=١ |

شی كردنەوە :-

١- مێرد نیوەی میراتە چونكە منال و نەوە ی میراتگر نیە

٢- داك : سێیەكی میراتە چونكە منال و نەوەی میراتگر و ژمارەی خوشك و برا نیە.

٣- كور بكوژ: هیچی نیە چونكە بكوژی دایكیەتی و ریگرە لە میرات.

٤- برا لە داك وباب ماوە دەبات بە تعصیب .

٥- ئەصلی مەسئەلە لە ٦ چونكە شەش یەك و سێیەك تداخلن گەورەكە وەردەگرین كە ٦

٥- دیاری كردنی بەشەكان بریتی یە لە دابەش كردنی ئەصلی مەسئەلە بەسەر سەهمەكان :مێرد ٦÷٢=٣ ، داك ٦÷٣=٢ ، برا لە داك وباب ماوە ٦-٥=١ .

■ حالەتەكانی ژن :

- چواریەكی میرات :- ئەگەر پیاوە مردوەكە منال یان نەوەی میراتگری نەبی چ لەو ژنە یان لە ژنێكی تر جا یەك ژن بیت یان دوو یان سێ یان چوار بە هەمویان یەك چواریەك دەبەن .
- هەشت یەكی میرات :- ئەگەر پیاوە مردوەكە منال یان نەوەی میراتگری هەبێ چ لەو ژنە یان لە ژنێكی تر جا یەك ژن بیت یان دوو یان سێ یان چوار بە هەمویان یەك هەشت یەك دەبەن .

نمونەی حالەتەكانی ژن :-

١- پیاوێك مردووە لەپاشی بە جێماوە ﴿ ژن – داك – ٢برا لە داك – برا لە داك وباب ﴾

| میراتگر | بەش | مەسئەلە |
|---|---|---|
| | | ١٢ |
| ژن | ١\٤ | ١٢÷٤=٣ |
| داك | ١\٦ | ١٢÷٦=٢ |
| ٢برا لە داك | ١\٣ | ١٢÷٣=٤ |
| برا لە د.ب | ماوە | ٣ |

شیكردنەوە :-

١- ژنەكە ١\٤ میرات چونكە فەرعی میراتگر نیە

٢- داك ١\٦ میرات چونكە فەرعی میراتگر نیە بەلام ٣ برا هەیە

٣- ٢برا لە داك ١\٣ چونكە ژمارەیان دووەو و منال و نەوەو باب و باپیر نیە .

٤- ماوە بۆ برا لە داك وباب بە عصبە بە نفس

٥- ئەصلی مەسئەلە لە ١٢ لەبەر هەبونی ٤\١ و ٦\١ نیوەی یەکیان جارانی تەواوی ئەوەی تر ٢×٦=١٢

٦- دیاری کردنی بەشەکان : بەشی ژن ١٢÷٤=٣ ،بەشی داك ١٢÷٦=٢ بەشی برا لە داك ١٢÷٣=٤ ،بەشی برا لە داك وباب ماوە ١٢-٩=٣ .

٢- پیاویك مردووە لەپاشی بەجێماوە ﴿ ٣ژن – داك – باب – ٣كچ﴾

| میراتگر | بەش | مەسئەلە | راست کردنەوە |
|---|---|---|---|
| | | ٢٤ عول بۆ ٢٧ | ٨١=٢٧×٣ |
| ٣ژن | ٨\١ | ٢٤÷٨=٣ هەرژنی ١سهم | ٩=٣×٣ |
| داك | ٦\١ | ٢٤÷٦=٤ | ١٢=٤×٣ |
| باب | ٦\١ ع | ٢٤÷٦=٤ | ١٢=٤×٣ |
| ٣كچ | ٣\٢ | ٢٤÷٣= ٨×٢=١٦ | ٤٨=١٦×٣ |

شی کردنەوە :-

١- ٣ژنەکە : هەشت یەك چونکە مردوەکە منالی میراتگری هەیە ٣كچ

٢- داك : شەش یەك چونکە مردوەکە منالی میراتگری هەیە ٣كچ

٣- باب : شەش یەك و عصبە چونکە مردوەکە منالی میراتگری هەیە ٣كچ

٤- ٣ کچەکە : دوو سێیەك چونکە عصبەیان نیەو ژمارەیان لەیەك زیاترە .

٥- دەرهینانی ئەصلی مەسئەلە: ئەصلەکەی لە ٢٤ چونکە ٨\١ و ٦\١ لەمەسئەلە هەیە و نیوەی یەکیان جارانی تەواوی ئەوەی تر واتە ٤×٦ وەیان ٣×٨ دەکاتە ٢٤ بەلام مەسەلەکە عەول دەبی بۆ ٢٧

٦- دیاری کردنی بەشەکان : ٣ژن : ٢٤÷٨=٣ هەر ژنی ١سهم ، بەشی داك ٢٤÷٦=٤ ، بەشی باب ٢٤÷٦=٤ ، بەشی ٣كچ ٢٤÷٣=٨ ئەمە یەك سییەکە جارانی ٢=١٦ واتە دوو سییەکی ٢٤=١٢

٧- راست کردنەوە : لەبەر ئەوەی بەشی کچەکان دابەش نابێ بەسەریان و لەنیوان ژمارەیان کە ٣ و بەشەکانیان کە ١٦ تباینە بۆیە ژمارەی سەرەکان جارانی مەسئەلەو بەشەکان دەکەین واتە ئەصلی مەسئەلە بە عەولەوە ٣×٢٧=٨١ ، بۆ ٣ژن ٣×٣=٩ هەرژنی ٣سهم ، بۆ داك ٣×٦=١٨ بۆ باب ٣×٦=١٨ ، بۆ ٣کچەکە ٣×١٦=٤٨ هەرکچی ١٦

**٣- پیاوێك مردووه لـه پاشی بەجێماوه ﴿ ژن - داك - کورێکی ناموسلمان - برا لـه باب ﴾**

| میراتگر | بەش | مەسئەلە |
| --- | --- | --- |
| | | ١٢ |
| ژن | ٤\١ | ١٢÷٤=٣ |
| داك | ٣\١ | ١٢÷٣=٤ |
| کور ناموسلمان | - | - |
| برا لەباب | ماوه | ١٢-٧=٥ |

**شی کردنەوه :-**

**١-ژن چواریەکی میراتە چونکە منال و نەوه ی میراتگر نیە - کورەکە میراتگر نیە -**

**٢- داك : سێیەکی میراتە چونکە منال و نەوەی میراتگر و ژمارەی خوشك و برا نیە.**

**٣- کور: هیچی نیە چونکە ناموسلمانە و ریگرە لـه میرات.**

**٤- برا لـه باب ماوه دەبات بە تعصیب .**

**٥- ئەصلی مەسئەلە لـه ١٢ چونکە چواریەك و سێیەك تباینن تەواوی یەکیان جارانی تەواوی ئەوەی تر ٣×٤**

**٥- دیاری کردنی بەشەکان بریتی یە لـه دابەش کردنی ئەصلی مەسئەلە بەسەر سەهمەکان :ژن ١٢÷٤=٣ ، داك ١٢÷٣=٤ ، برا لـه باب ماوه ١٢-٧=٥ .**

==================================================

## ﴿ سێیەم// میراتی خوشك وبرا لـه داك ﴾

ئەصل لـه بون به میراتگری خوشك و برا لـەداك ئایەتی ١٢ لـه سورەتی النساء :-

﴿ وان كان رجل یورث كلالة او إمرأة وله اخ او اخت فلكل واحد منهما السدس وان كانوا اكثرمن ذلك فهم شركاء في الثلث ... ﴾

مەبەست لـه – كلالـه – واتە مردوەكە ئەصل و فەرعی میراتگری نیە هەروەك ریوایەت كراوە لـه شەعبی كە پرسیاریان لـه پێشەوا ئەبوبەكری صدیق رەزای خوای لـەسەربێ كرد لـه تەفسیری – كلالـە– فەرموی بەبۆچونی خۆم و بەرای خۆم وەلام دەدەمەوە ئەگەر ماناكای راست بێت ئەوا لـه خواوەیە و ئەگەر ناراستیش بیت ئەوە لـه منەوەو لـەشەیتانەوەیە و خواو پێغەمبەرەكەی لـێی بەرینە : فەرموی كلالـه بەو كەسە دەگوترێ نە منال و نەباوكی نیە ، ئینجا كاتێك پیشەوا عومەر رەزای خوای لـەسەربێ دەسەلاتی گرتە دەست فەرموی شەرم دەكەم بە پێچەوانەی راو بۆچونی ئەبوبكری صدیق رەزای خوای لـەسەر بێ بجولـێمەوە . كەواتە لـەو ئایەتەی سەرەوە باسمان كرد دیاركەوت كە مەبەست لـیرەدا تەنها ئەو خوشك وبرایانەی مردوەكە دەگرێتەوە كە تەنها لـه دایكن ئەمەش بەبەلـگەی قیرائەتی سعدی كوری ئەبی وقاچ خویندویەتیەوە ( وله اخ او اخت من ام ) .

تێكرای زانایان لـەسەرئەوەن كە مەبەست لـه خوشك وبرای مردوەكە لـەم ئایەتەدا تەنها خوشك وبرای مردوەكەن لـەداك وە بەلـگەشیان ئەوەیە خوای تعالی دوو جار و لـه دوو شوێن باسی خوشك وبرای مردووی كردوە یەكیان ئەم ئایەتەی سەرەتای سورەتی النساء ئایەتی ١٢ و ئەوەی تریان لـه كۆتایی سورەتی النساء باس كراوە جا لـەم ئایەتەدا ئاماژەی بەوە كردوە ئەگەر هاتوو ژمارەیان یەك زیاتر نەبی ئەوە شەش یەكی دیاری كردوە وە ئەگەر بون بە دوو یان زیاتر ئەوە دەبی بەسێیەك بەیەكسانی بەسەریان دا دابەش دەكرێ ، بەلام ئەوەی كە لـه كۆتایی سورەتەكە باس كراوە بۆ یەم خوشك نیوەی داناوەو بۆ دوو یان زیاتر دوو سێیەكی داناوە و بۆ نێرینەش هەموی كەواتە لـیرەوە دەردەكەوی جۆریان جیاوازە وە لـەكاتیك خوشك وبرا لـه داك و باب یان تەنها لـەباب لـه مردوەكە نزیكترن بۆیە بەشی زیاتریان بۆ دانراوە هەروەك لـه كۆتایی سورەتەكە ئاماژەی پێ كراوە[1] .

جیاوازی نێوان خوشك وبرای مردوەكە لـەداك لـەگەل میراتگرەكانی تر :-

١- خوشك وبرای لـه داك میراتگرن لـەكاتێك نزیك بونەوەیان لـه مردوەكە لـەلایەنی داكە واتە بەهۆی دایكی مردوەكەیە ئەمەش جیا لـەو یاسایەگشتی یەی میرات كە دەفەرموێ : (كەسێك بەهۆی میراتگریكی تر نزیك بیتەوە لـه مردوەكە ئەوە هەتا نزیكەكە مابی دورەكە ناگرێ ) كەچی لـیرە دایكەكەش دەگری و خوشك وبراكەی لـه دایكیش .

[1] يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِى ٱلْكَلَٰلَةِ ۚ إِنِ ٱمْرُؤٌا۟ هَلَكَ لَيْسَ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَهُۥٓ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ ۚ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَتَا ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ ۚ وَإِن كَانُوٓا۟ إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَآءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۗ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّوا۟ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ.

٢- خوشك وبرا لەداك نێر و مێییان یەكسانن لە وەرگرتنی میرات.

٣- ئەگەر باب و باپیر و منال و نەوەی مردوەكە هەبی خوشك وبرا لە داك بێبەش دەبن بەلام ئەوانی تر تەنها بە باب و كور بیبەش دەبون .

٤- بەشیان لە سێیەك زیاد ناكات هەرچەندە ژمارەشیان زیاد بێت .

كەواتە بە كورتی میراتیان بەم شێوەیە دەبێت :-

- شەش یەك : ئەگەر هاتوو ژمارەیان لەیەك زیاتر نەبی واتە تەنها یەك خوشك یان یەك برا لە داك بێت.
- سێیەك : ئەگەر ژمارەیان ببێ بە دوو یان زیاتر جا تەنها نیر بن یان تەنها مێ بن یان نێر و مێ بن بەیەكسانی بەسەریان دا دابەش دەكرێ

نمونە١:- كەسێك مردووە لەپاشی بەجێماوە ﴿ ٤ خوشك و برا لە داك - ٢ خوشك لە داك وباب - ١برا لە باب ﴾

| میراتگر | بەش | مەسئەلە | راست كردنەوە |
|---|---|---|---|
| | | ٣ | ١٢=٤×٣ |
| ٤خوشك لە داك | ٣\١ | ١ | ٤=٤×١ |
| ٢خوشك لە داك وباب | ٣\٢ | ٢ | ٨=٤×٢ |
| ١ برا لەباب | ماوە | - | - |

شی كردنەوە :-

١- ٤ خوشك لە داك سێیەكی میرات چونكە ژمارەیان لەیەك زیاترە

٢- ٢خوشك لەداك وباب دوو سێیەك ژمارەیان لەیەك زیاترە و عصبەیان نیە .

٣- برا لەباب ماوە دەبات بە عصبە بالنفس .

٤- دەرهینانی ئەصلی مەسئەلە : ئەصلەكەی لە ٣ چونكە ٣\١ و ٣\٢ و ماوە هەیە

٥- دیاری كردنی بەشەكان :- ئەصلی مەسئەلە داەبەشی سەر بەشەكان بكە : بەشی چوار خوشك لەداك : ٣÷٣=١ سهم ، بۆ ٢ خوشك لە د.ب : ٣×٣ =١ ئینجا جارانی ٢=٢ ، وە هیچ بۆ برای لەباب نەماوە .

٦- راست كردنەوەی دەوی : ژمارەی خوشكەكان لەداك ٤ لەگەل سەهمەكەیان ١ تباینە و ژمارەی خوشكان لە داك وباب ٢ و سەهمەكەیان ٢ توافق بە نیوە ئینجا لە نیوان ژمارەی خوشكان لە داك ٤ و خوشكانی لە د.ب ٢ تداخلە واتە گەورەكە كە ٤ جارانی مەسئەلەو بەشەكان دەكەین .

نمونە : کەسێك مردوە لەپاشی بەجێماوە ﴿ کچ – کچی کور – خوشك لە داك وباب – ١ برا لەداك﴾

| میراتگر | بەش | مەسئەلە |
|---|---|---|
| | | ٦ |
| کچ | ٢\١ | ٣ |
| کچی کور | ٦\١ | ١ |
| ١ خوشك لە داك وباب | ماوە | ٢ |
| ١ برا لەباب | – | – |

مەسئەلەی – المشترکە –

{ مشرکە – عمریە – یمیە – حجریە – حماریە } :

لەیەکێ لە یاسا نەگۆڕەکانی میرات ئەوەیە ئەگەر لەمەسەلەدا خاوەن بەش و عصبە هەبون ئەوا خاوەن بەشەکان مافی تەواوی خۆیان پێ دەدری و ماوە بۆ عصبە دەبێ بەبەلگەی فەرمودەی پێغەمبەرمان صلی الله علیە وسلم {الحقوا الفرائض باهلها فما بقي فلأولی رجل ذکر } بەلام مەسئەلەیەکمان هەیە لەم یاساوە جودا کراوەتەوە ئەویش المشترکە کە لەم میراتگرانە پێکهاتووە ﴿ مێرد – داك یان داپیر – ژمارەیك واتە دوو یان زیاتر لە خوشك وبرا لەداك – یەك یان زیاتر لە برای مردوەکە لەداك وباب .﴾ جا لەم مەسئەلەدا پاش وەرگرتنی خاوەن بەشەکان هیچ بۆ برای لەداك وباب کە عصبیە نامێنێ بۆیە براکەی لەداك وباب وەکو برایەکی لەداك ئەژمار دەکەین ، ئەم مەسئەلە لەسەردەمی پیشەوا عومەر ڕەزای خوای لەسەربێ رووی داوە دیارە کە ئەویش بەیاساکە حەلی کردوە برا لە داك و باب هیچی بۆ نەماوەتەوە بۆیە براکەی لەداك وباب وەکو برایەکی لەداك ئەژمار کرا ئەمە هەمان بۆچونی جمهوری زانایانە بەلام پیشەوا عەلیڕەزای خوای لەسەربێ بەیاساکەی حەل کردوەو برای لەداك وباب هیچی پێ نەدراوە .

نمونەی المشترکە : ژنێك مردوە لەپاشی بەجیماوە ﴿مێرد – داك یان داپیر – ژمارەیك واتە دوو یان زیاتر لە خوشك وبرا لەداك – یەك یان زیاتر لە برای مردووەکە لەداك وباب .﴾

| میراتگر | بەش | مەسئەلە | راست کردنەوە |
|---|---|---|---|
| | | ٦ | ٦×٤=٢٤ |
| مێرد | ٢\١ | ٦÷٢=٣ | ٣×٤=١٢ |
| داك | ٦\١ | ٦÷٦=١ | ١×٤=٤ |
| ٣خوشك وبرا لە د | ٣\١ | ٦÷٣=٢ | ٢×٤=٨ هەریەکەی ٢بەش بەیەکسانی |
| ١برا لەد.ب | | | |

==========================================================

# ﴿ چوارەم // میراتی کچی مردووەکە ﴾

ئەصل لە میراتی کچی کور ﴿ یوصیکم الله فی اولادکم ......﴾ –١١– النساء

**حالەتەکانی کچی مردووەکە :–**

بەگوێرەی ئایەتەکە سیٚ حالەتی هەیە:–

١– نیوەی میرات : ئەگەر ژمارەکەی لە یەك تێپەر نەکات و عصبەی نەبێت .

٢– دوو سێیەکی میرات: ئەگەر هاتوو ژمارەیان دوو یان زیاتر بیت و عصبەیان نەبی

٣– بەتعصیب واتە للذکر مثل حظ الانثیین ئەگەر مردووەکە کوری هەبی دەبن بە عصبە لەگەل کچ.

نمونە ١ :– پیاوێك مردوە لە پاشی بەجیماوە : ژن – داك – کچ – کوری برای مردووەکە لە داك و باب :

| ژن | داك | کچ | کوڕەبرا لەداك وباب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٨ | ١/٦ | ١/٢ | ماوە بە عصبە | ٢٤ |
| ٣ | ٤ | ١٢ | ٥ | |

هەنگاوەکانی شی کردنەوە :–

١) ژنەکە هەشت یەکی میراتی هەیە چونکە مردووەکە منالی هەیە .

٢) داكی مردوەكە شەش یەكی میراتی هەیە چونكە مردوەكە منالی هەیە .
٣) بۆ كچەكە نیوەی میرات چونكە مردوەكە لە منال لەو كچە زیاتری نیەو وە ئەوكچە برای نیە بیكات بە عصبە
٤) ماوە بۆ كورە براكەی لەداك وباب دەبی بە عەسەبە .
٥) بۆ زانین و دەرهینانی ئەصلی مەسئەلە سەیری بەشەكان دەكەین وەك لەم نمونەدا : واتە هەشت یەك و شەش یەك هەیە هەیە كەواتە نیوەی یەكیان جارانی تەواوی ئەوەی تر بكە واتە { ٤×٦=٢٤} یان { ٣×٨=٢٤}
ئەصلی مەسئەلە لە (٢٤)
٦) ئەصلی مەسئەلە دابەشی سەر بەشەكان بكە : بەشی ژن { ٢٤÷٨=٣} بۆ ژنەكە ٣ سهم – بەشی داك {٢٤÷٦=٤} بەشی داك ٤سهم ، بەشی كچەكە {٢٤÷٢=١٢ } واتە ١٢ سهم وە ماوە بۆ كورە براكەی براكەی لە داك وباب دوای دەركردنی بەشی میرد و داكەكە و كچەكە واتە {٢٤–١٩=٥ } واتە پینج سهم
نمونە ٢ :– كەسێك مردوە لەپاشی بە جێماوە : كچ– باب – برا لە داك وباب – برا لەباب

| میراتگر | بەش | مەسئەلە |
|---|---|---|
| | | ٦ |
| كچ | ٢\١ | ٣ |
| باب | ٦\١ ع | ٢+١ |
| برا لە داك وباب | – | – |
| برا لە داك | – | – |

شی كردنەوە :–

١ – كچەكە نیوەی هەیە چونكە چونكە تەنهایەو عصبەی نیە

٢– باب شەش یەك وماوە چونكە فرعی میراتگر هەیە بەلام كور نیە.

٣– برا لەداك و باب بیبەشە بە باب و برا لەداك بیبەشە بە باب و كچ

٤– ئەصلی مەسئەلە لە ٦ چونكە ٦\١ و نیوەهەیە

٥– ئەصلی مەسئەلە دابەشی سەربەشەكان بكە : بۆ كچەكە ٦÷٢=٣ سهم ، بۆ باوكەكە ٦÷٦=١ لەگەل ماوە واتە ١+٢= ٣سهم.

**نمونە ٣:- کەسێك مردووە لەپاشی بەجێماوە ﴿ ٣کچ – کور– داك – برا لەباب ﴾**

| میراتگر | بەش | مەسئەلە | |
|---|---|---|---|
| | | ٦ | |
| ٣کچ | تعصیب | ٥ | ٣ |
| کور | | | ٢ |
| داك | ٦\١ | ١ | |
| برا لە باب | – | – | |

**شی کردنەوە :-**

**١- داك شەش یەکی هەیە چونکە مردوەکە منالی هەیە .**

**٢- ماوە بۆ ٣کورو کچ بە تعصیب**

**٣- برا لەباب بیبەشە بە کور**

**٤- ئەصلی مەسئەلە: لە ٦ چونکە شەش یەك و ماوە هەیە**

**٥- بەشەکان : داك ٦÷٦=١ ، ماوە بۆ کورو ٣کچ ٥سهم بۆ کورەکە ٢سهم و بۆ هەرکچی ١شهم .**

==========================================================

# ﴿ پێنجەمین // میراتی کچی کور ﴾

کچی کور لـە شوێنی کچە ئەگەر کچ نەمابیٚ کەواتە کچی کوری مردوەکە ئەم حالـەتانەی هەیە :-

← حالـەتی یەکەم : ئەگەر هاتوو میراتگری نیرنە نەبی لـە منال و نەوەی مردوەکە واتە کورو کوری کور نەبێت ئەوا سیٚ حالـەتی هەیە :

❖ نیوەی میرات :- بەمەرجێك مردوەکە کچی نەبی.واتە بەس نەوە هەیە .

نمونە : کەسێك مردووە لـەپاشی بەجێماوە ﴿ ژن – باب – ١ کچی کور ﴾

| میراتگر | بەش | مەسئەلـە |
|---|---|---|
| | | ٢٤ |
| ژن | ٨\١ | ٣ |
| باب | ٦\١ ع | ٤+٥=٩ |
| ١کچی کور | ٢\١ | ١٢ |

شی کردنەوە :-

←ژنەکە هەشت یەکی هەیە چونکە فەرعی میراتگر هەیە

←باب شەش یەك و عصبە چونکە فەرعی میراتگری مێینە هەیە

← کچی کور نیوەی هەیە چونکە تەنهایەو عصبەی نیەو هەروەها مردوەکە کورو کچی نیە

← ئەصلی مەسئەلە لـە ٢٤ لـەبەر هەبونی ٨\١ و ٦\١

← بەشەکان :- ژن : ٢٤÷٨=٣ سهم ، کچ ٢٤÷٢=١٢ سهم ، باب ٢٤÷٦=٤ لـەگەل ماوە ٥ =٩ سهم

❖ دوو سێیەکی میرات:- ئەگەر ژمارەیان دوو یان زیاتر بوو وە عصبەیان نەبو و مردوەکە کورو کچی نەبوو :-

نمونه : پیاویك مردوه لەپاشی بەجێماوە ﴿ ژن – ٣ كچی كور – برا لە داك وباب ﴾

| میراتگر | بەش | مەسئەلە |
| --- | --- | --- |
| | | ٢٤ |
| ژن | ٨\١ | ٣ |
| ٤ كچی كور | ٣\٢ | ١٦ |
| برا لە داك وباب | ماوە | ٥ |

شی كردنەوە :-

➔ژنەكە هەشت یەكی هەیە چونكە فەرعی میراتگر هەیە

➔٣ كچی كور ٣\٢ چونكە ژمارەیان ٤ و عصبەیان نیە و كور و كچ نیە

➔ برا لە داك وباب ماوە دەبات بە تعصیب

➔ ئەصلی مەسئەلە لە ٢٤ لەبەر هەبونی ٨\١ و ٣\٢

➔ بەشەكان :- ژن : ٢٤÷٨=٣ سهم ، ٤كچ ٢٤÷٣=٨ سهم جارانی ٢= ١٦ سهم هەركچی ٤ سهم، برا لە داك وباب ماوە ٢٤-١٩=٥ سهم .

❖ شەش یەكی میرات :- ئەگەر مردوەكە یەك كچ زیاتری نەبی وە كچانی كور دوو بن یان زیاتر شەش یەك بەهەمویان .

نمونە: كەسێك مردووە لەپاشە بە جێماوە ﴿ باب – داك – كچ – ٢ كچی كور ﴾

| میراتگر | بەش | مەسئەلە | راست كردنەوە |
| --- | --- | --- | --- |
| | | ٦ | ٦×٢=١٢ |
| باب | ٦\١ع | ١ | ١×٢=٢ |
| داك | ٦\١ | ١ | ١×٢=٢ |
| ١كچ | ٢\١ | ٣ | ٣×٢=٦ |
| ٢كچی كور | ٦\١ | ١ | ١×٢=٢ |

شی كردنەوە :-

➔ باب شەش یەك و عصبە چونكە فەرعی میراتگری مێینە هەیە

➔ داك شەش یەك چونكە فەرعی میراتگرهەیە.

➔ کچ نیوەی هەیە چونکە تەنهایەو عصبەی نیە

➔ ٢کچی کور شەش یەکیان هەیە چونکە عصیەیان نیەو مردوەکە یەك کچی هەیە

➔ ئەصلی مەسئەلە لە ٦ لەبەر هەبونی ٦\١ و نیوە هەیە تداخلە

➔ بەشەکان :- باب : ٦÷٦=١، داك ٦÷٦=١سهم ،کچ ٦÷٢=٣ سهم ، ٢کچی کور ٦÷٦=١سهم تصحیحی دەوی مەسئەلەو بەشەکان جارانی ٢ دەکەین بە ژمارەی کچانی کور : باب ٢سهم ، داك ٢سهم ، کچ ٦ سهم ، ٢کچی کور ٢ سهم هەرکچی کور ١سهم.

❖ بێبەشەو هیچی نیە لە میرات :

نمونە : کەسێك مردووە لەپاشە بە جێماوە ﴿ باب – داك – کچ – ٢ کچی کور ﴾

| میراتگر | بەش | مەسئەلە |
|---|---|---|
| | | ٦ |
| باب | ٦\١ ع | ١ |
| داك | ٦\١ | ١ |
| ٢کچ | ٣\٢ | ٤ |
| ١کچی کور | – | – |

شی کردنەوە :-

➔ باب شەش یەك و عصبە چونکە فەرعی میراتگری مێینە هەیە

➔ داك شەش یەك چونکە فەرعی میراتگرهەیە.

➔ ٢کچ دوو سێیەکیان هەیە چونکە ژمارەیان لەیەك زیاترە

➔ ١کچی کور بیبەشە چونکە مردوەکە ٢ کچی خۆی هەیە تەواوی دوو سێیەکەکەیان بردوە .

➔ ئەصلی مەسئەلە لە ٦ لەبەر هەبونی ٦\١ و ٣\٢ هەیە

➔ بەشەکان :- باب : ٦÷٦=١، داك ٦÷٦=١سهم ،٢کچ ٦÷٣=٢ سهم جارانی ٢= ٤سهم ، ١کچی کور بیبەشە بە هەبونی ٢کچی مردوەکە.

➜ **حالـەتی دووەم :- هەبونی میراتگری نیرینە لـە منال و نەوەی مردوەکە :-**

- **هیچی نیەو بێبەشە لـە میرات ئەگەر مردوەکە نێرینەی نزیکتری هەبێ لـە پلـەی ئەم کچەی کور :**

**نمونە : کەسێك مردوە لـەپاشی بەجێماوە ﴿ کور – ٢کچی کور ﴾ دوو کچەکەی کور بێبەشن و میراتەکە هەموی بۆ کورەکە دەبی چونکە کورەکە نزیکترە لـە مردوەکە لـە کچی کور.**

- **دەبێتە عصبە ئەگەر نێرینە لـە پلـەی خۆی هەبێ واتە کوری کور هەبێ جا ئەو کورەی کور برای کچی کور بی یان کورە مامی بێت .**

**نمونە:- پیاوێك مردوە لـەپاشی بەجێماوە ﴿ ژن – باب – داك – کچی کوری کور – کوری کوری کور ﴾**

| میراتگر | بەش | مەسئەلـە | راست کردنەوە | |
|---|---|---|---|---|
| | | ٢٤ | ٧٢=٣×٢٤ | |
| ژن | ٨\١ | ٣ | ٩ | |
| داك | ٦\١ | ٤ | ١٢ | |
| باب | ٦\١ | ٤ | ١٢ | |
| کوری کوری کور | ماوە تعصیب | ١٣ | ٣٩ | ٢٦ |
| کچی کوری کور | | | | ١٣ |

**شی کردنەوە :-**

**١- ژنەکە ٨\١ هەیە چونکە فەرعی میراتگر هەیە**

**٢- هەریەك لـەباب و داك ٦\١ هەیە چونکە فەرعی میراتگر هەیە لـە نێر و مێ**

**٣- ماوە بە تعصیب بۆ کوری کوری کور و کچی کوری کور .**

**٤- ئەصلی مەسئەلـە لـە ٢٤ لـەبەر هەبونی ٨\١ و ٦\١**

**٥- بەشەکان : ژن : ٢٤÷٨=٣سهم ، داك ٢٤÷٦=٤سهم ، باب ٢٤÷٦=٤سهم ، ماوە بۆ نەوەکان ١٣ سهم دابەشی سەریان نابی بۆیە مەسئەلـە جارانی ٣ دەکەین دوو بەشی کوری کوری کور و بەشێکی کچی کوری کور واتە :٢٤×٣=٧٢ ، ژن ٨×٣=٢٤ ،باب ٤×٣=١٢ ،داك ٤×٣=١٢ ، ماوە ١٣×٣=٣٩ بۆ کوری کوری کور ٢٦ سهم و بۆ کچی کوری کور ١٣ سهم.**

چۆنیەتی میراتی ئەم چینە :- ئەم چینەی چوارەم میراتیان بەرناکەوی ئەگەر یەك لەو سیٚ چینەی پیشوو هەبن هەروەها تایفەکان بە ترتیبن هەتا یەم هەبی تایفەی دوەم نابا...    ئەمانەش وەکو ئەوانەی تر کەباسمان کرد نزیکەکە دورەکە بیبەش دەکات  و بەخاوەن فەرز و بە عصبە لە پیش ترە لە نزیك بوەوە بەخاوەن رەحم. نمونە :- ئەگەر کەسێك مرد لەپاشی بەجیٚما ﴿ خالەت و کوری خالەت و کچە مام و کورەخال ﴾ ئەوا میراتەکە هەمووی بۆ خالەت دەبیٚ چونکە لە تایفەی یەکەمە و کچە مام و کورە خال لە تایفەی دووەمن .

- ئەگەر هاتوو لە تایفەکی زیاتر هەبون ئەوا وەکو میراتی چینی یەکەم دابەش دەکریٚ واتە تائفە وەکو چین حیساب دەکری واتە پلە نزیکەکە لەپیشترە ئەگەر یەکسان بوون ئەوا کامیان بەهیزترە لە پیشترە واتە منالەکانی لە داك وباب نزیکترن لەوانە تەنها بەریگای باب دەگەن بە مردوەکە هەروەها لایەنی باب لەپیشترە لە لایەنی داك . نمونە :- لەپاشی بەجیٚماوە ﴿ کوری خالە تلە داك وباب – کوری خالەت لەباب – کوری خالە ت لە داك ﴾ میراتەکە هەموی بۆ کورە خالەتە لە داك وباب لەبەر نزیکیەکەی وە ئەگەر ئەو نەباب لۆ کورە خالە ت لەباب دەبوو .
- بە نیسبەت خالەکان و مامەکان لە داك و منالەکانیان ئەگەر لە نزیك بونەوە وەکو یەك بون ئەوا ئەوەی لایەنی باب دوو سەهمەو لایەنی داك یەك سهم . نمونە :- لە پاشی بە جیماوە ﴿ عمەت {خوشکی باب } – خال ﴾ ئەوا دوو سەهم بۆ عمەتەکە دەبیٚ چونکە لایەنی باوکە و یەك سهم بۆ خال دەبیٚ چونکە لایەنی داکە .

==============================================

## پێناسەی التخارج و جۆرەکانی :-

تخارج: بریتی یە لە صولح کردنی یەکێك لە میراتگران لەگەڵ میراتگرەکانی تر تاوەکو دەرچێ لە میرات بەرامبەر مەبلەغێك یان شتێکی دیاری کراو جا لە میراتەکە بیت یان لە غەیری میراتەکە .

تخارج سێ جۆری هەیە :

١- یەکێك لە میراتگرەکان لەبەشی خۆی دەردەچێ بۆ میراتگریکی تر لەبەرامبەر مەبلەغیك یان شتێکی تر دور لە میرات لەم حالەتە میراتەکە بەش دەکرێت کە دەرچوەکەشی لەگەڵ دابێت پاشان هەریەکە و بەشی خۆی پێ دەدرێ تەنها دەرچوەکە نەبێت بەشەکەی دەدرێ بەو کەسەی کە صولحی لەگەڵ کردوە .

نمونە : لەپاشی بەجێماوە ﴿ کچ- ٢خوشك لە داك وباب ﴾ یەك لە خوشکەکان صولحی لەگەڵ خوشکەکەی کرد کە بەشی خۆی بداتی ئەگەر ئەو ١٥٠٠دۆلاری بداتی :ئەوا کچەکە نیوەی میراتی هەیە و ماوە بۆ خوشکەکە دەبی کە پارەکەی داوە بە خوشکە دەرچوەکە واتە بەشی خۆی و بەشی خوشکە کەی کە پارەی وەرگرتوە .

نمونە :- لە پاشی بەجێماوە ﴿ باب – داك – کچ – کچی کور ﴾ داکەکە صولحی لەگەڵ کچی کور کرد ئەگەر ٨٠٠ دۆلاری بداتی ئەوا دەردەچی لە میرات و بەشەکەی بۆ کچی کوربیت ئەویش رازی بوو :

| میراتگر | بەش | مەسئەلە |
|---|---|---|
| | | ٦ |
| باب | ٦\١ع | ١ |
| داك | ٦\١ | ١ |
| کچ | ٢\١ | ٣ |
| کچی کور | ٦\١ | ١+١=٢ |

٢- یەکێ لە میراتگرەکان لەبەشی خۆی بۆ هەموو میراتگرەکانی تر دەردەچێ بەرامبەر مەبلەغیك یان شتیك لە دەرەوەی میراتەکە لەم حالەتە بەهەمان شێوە میراتەکە بەش دەکری و بەشی هەریەکەیان دیاری دەکرێ وبەشی دەرچوەکە بەسەر هەموان دابەش دەکری بە گویرە ریك کەوتنی خۆیان لەگەڵ دەرچوەکە ئەگەر نا بەیەکسانی بەسەریان دا بەش دەکرێ بەلام ئەگەر ئەوەی کە دابویان بە دەرچوەکە بەیەکسانی نەبوو بەلکو بەشەکان جیا بون لەو کاتب ە گویرەی نیسبەتی مەبلەغەکەی کە دایانە بە کەسەکە دابەش دەکری واتە هەریەکە و بە ئەندازە ئەو مەبلەغەی کە داویەتی

٣- یەکێك لە میراتگران دەردەچیٚ بۆ هەموو میراتگرەکانی تر لە بەرامبەر وەرگرتنی مەبلەغیك یان شتیکی دیاری کراو لە میراتەکە. لەم حالەتە میراتەکە بەش دەکریٚ وبەشی دەرچوەکە لادەبردری و ئەوەی ماوە دەکری بە ئەصلی مەسئەلەکە . بۆن مونە: ژنێك مردوە لە پاشی بەجێماوە ﴿ مێرد – داك – خوشك لە داك وباب – خوشك لە باب – خوشك لە داك ﴾ وە لە پاشی بەجیماوە ١٦٠ دۆنم زەوی خوشکەکە لەباب لە بەرامبەر مەبلەغیك پارە دەردەچی لە میراتەکە بەم شیوەیە دەکریٚ:

<table>
<tr><th>میراتگر</th><th>بەش</th><th>مەسئەلە</th><th></th></tr>
<tr><td></td><td></td><td>٦عول بۆ ٩</td><td rowspan="6">پاش ئەوەی بەشەکان دیاری کران بەشی خوشکەکەی لەباب ١سهم دەردەکەین ژمارەی سهمەکان ٩ بوو ئیستا بو بە ٨ کەواتە میراتەکە دابەشی سەر ٨ دەکەین وەکو ئەصلی مەسئەلە</td></tr>
<tr><td>مێرد</td><td>٢\١</td><td>٣</td></tr>
<tr><td>داك</td><td>٦\١</td><td>١</td></tr>
<tr><td>خوشك لە داك وباب</td><td>٢\١</td><td>٣</td></tr>
<tr><td>خوشك لە باب</td><td>٦\١</td><td>١</td></tr>
<tr><td>خوشك لە داك</td><td>٦\١</td><td>١</td></tr>
</table>

١٦٠ دۆنم زەوی ÷٨= ٢٠ دۆنم ، بۆ مێردەکە ٣×٢٠= ٦٠ دۆنم بۆ دایکەکە ١×٢٠=٢٠ دۆنم بۆ خوشکەکەی لە داك وباب ٣×٢٠=٦٠ دۆنم و بۆ خوشکەکەی لە داك ١×٢٠=٢٠ دۆنم .

والله تعالی اعلم

==========================================================

# ﴿ بابەتی المناسخات ﴾

**<u>پێناسەی – المناسخات – :–</u>** ( المناسخات ) کۆی ووشەی ( مناسخه) یه واته :– لابردن – گواستنەوه ،بەلام لە روانگەی شەرعەوه :– بريتی يه لەوەی كه يەكيك يان زياتر لە ميراتگری مردوو بمری پێش ئەوەی ميراتەكەی مردووی يەكەم بەش بكرێ، بەمانايەكی تر يەكێك مردووه هيشتا ميراتەكەی بەش نەكراوه يەكێك يان زياتر لە ميراتگرەكانی بمری يان بمرن.

**<u>هۆكاری ناوبردنی بە مناسخه:–</u>** چونكه مەسەلەی مردووی يەكەم لابراوه بە مەسەلەی مردووی دووەم يان حوكمەكەی لابراوه يان مالەكە گوازراوەتەوه لە ميراتگريك بۆ ميراتگرێكی تر.

واته ئەم موناسەخەيە بۆ ئەمەيە كه بمانەوی ميراتەكە دابەش بكەين تا بزانين بەشی مردووی دوەم چەندە لە مردوی يەكەم تا بدری بە ميراتگرەكانی مردووی دووەم.

تێبينی:– تەنها ئەوە موناسەخەيە كەبەشی هەيە لە مردوی يەكەم بەلام مردوی دوەم كە مال و سامانی خۆی هەيە بەشيوەی ئاسايی خۆی دابەشی سەر ميراتگرەكانی دەكريت نەوەك تيكەل بە موناسەخە بكرێ.

**﴿حالەتەكانی موناسەخه ﴾**

<u>موناسەخه سێ حالەتی هەيە :</u>

حالەتی يەكەم:– ميراتگرەكانی مردووی دووەم هەمان ميراتگرەكانی مردووی يەكەمن.

حالەتی دووەم:– ميرات گرەكانی مردووی دووەم و ئەوانەی پاش ئەوانيش ميرات لەيەكتر ناگرنەوه تەنها لە مردوی خۆيان واته ميراتگرانی مردوی دوەم تەنها لە دوەم دەگرنەوه هی سێيەم تەنها لە سێيەم دەگرنەوه.....

حالەتی سێيەم:– ميراتگرانی مردووی دووەم ئەوانەی دوای ئەوانيش ميراتگری مردووی يەكەمن و ميراتگری تريشيان لەگەل دايه بەلام ميراتەكەيان جودايه .

حالەتی يەكەم لە موناسەخه

ميراتگرەكانی مردووی دووەم هەمان ميراتگرەكانی مردووی يەكەمن.

شێوازی حەل كردنی ئەم حالەته :– مردووی دووەم و سێيەم و ... وادادەنێين هەر بونيان نەبووه واته ئەوەی ئيستا ماون دەدری بە ئەوان ، بۆ نمونه ( ئافرەتێك مردووه بەناوی – فاتمه – لەپاشی بەجێماوه داپيرەيەك خوشكەكی لە داك و باب

**بەناوی – زینب – و خوشکەکی لەباب بەناوی – عائشە – هیشتا میراتەکە دابەش نەکرابوو عائشەی خوشکی فاتمە شوی بە میردی فاتمە کرد لە مەسئەلەکە ئینا عائشە مرد لەو حالەتە هیچ لە مەسەلە ناگۆرێ میرات گری هەردوو مردوەکە هەر مێرد و داپیرەك وخوشکەکی لەداك وبابە :–**

| مێرد | داپیر | خوشك لە د.ب –زینب– | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٦ | ١/٢ | ٦ |
| ٣ | ١ | ٣ | عول ٧ |

**نمونەیەکی تر:– پیاوێك مرد شەش برای لە داك وبابی لە پاش بە جێمابوو میراتەکە بەش نەکرا تا چواریان مردن یەك لە دوای یەك تەنها دوو ماوە وە هیچ میراتگری تریان نیە کەواتە میراتەکە دەکری بە دوو بەش هەر برای بەشیك.**

**نمونەیەکی تر: پیاویك مرد لەپاشی بەجێما( داك – ٤ برا لەداك ) میراتەکە بەش نەکرا تا ٢برا لە داك مردن وە لەو میراتگرانە زیاتر نەبون بۆیە:**

| داك | ٢برا لەداك | مەسئەلە |
|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٣ | ٦ |
| ١ | ٢ | مەسئەلەکە ردە واتە ١+٢=٣ |

**پاش ئەوەی داکەکە شەش یەکی برد و ٢براکەی لە داك سێیەکیان برد مەسەلەکە رەدە چونکە ١ بەشی داك و ٢ بەشی دوبرا = ٣ کەچی ٣ ماوە بۆیە ژن و میرد لەمەسەلە نیە کەواتە بەشەکان کۆبکەوە و بیکە بە ئەصلی مەسئەلە واتە ١+٢= ٣ یەك بەشی داك بەفەرز و رەد و هەر برای بەشێك بە فەرزو رەد. ---**

**————————————————————————————————————————————————**

**حالەتی دووەم لە موناسەخە**

**میرات گرەکانی مردووی دووەم و ئەوانەی پاش ئەوانیش میرات لەیەکتر ناگرنەوە تەنها لە مردوی خۆیان واتە میراتگرانی مردوی دوەم تەنها لە دوەم دەگرنەوە هی سێیەم تەنها لە سێیەم دەگرنەوە.....**

**بەمانایەکی رۆنتر میراتگری مردووی یەکەم لەناو میراتگری مردووەم نیە.**

حالەتی سێیەم لە مناسخە

میراتگرانی مردووی دووەم ئەوانەی دوای ئەوانیش میراتگری مردووی یەکەمن و میراتگری تریشیان لەگەل دایە بەلام میراتەکەیان جودایە .

چۆنیەتی حەل کردنی نمونەی حالەتی دووەم و سێیەم ان شاء الله رۆن دەکەینەوە پاش باس کردنی دەستوری موناسەخەی حالەتی دوەم و سێیەم :–

ئەگەر هاتوو یەکێك مرد هێشتا میراتەکەی بەش نەکرابوو یەکێکی تر لە میراتگرەکانی مردوی یەکەم مرد تا بتوانین ئەم جۆرە میراتە بەش بکەین پێویستیمان بەم خالانەی خوارەوە هەیە :

- مەسەلەیەك دروست دەکەین بۆ مردوی یەکەم بەشێوەیەکی ئاسایی وەك لە پێشتر باس کراوە کە مردوی دوەم بە زیندو دائەنرێ و بەشەکان بەشێوەی ئاسایی بەش دەکرێ .
- ئەگەر تصحیحی دەوێت پێویستە تصحیحی بکەین.
- مەسەلەیەکی تر دروست دەکەین بۆ مردوی دووەم و دیاری کردنی بەشی میراتگرانی مردوی دوەم
- ئەگەر تصحیحی پێویستە بیکە.
- سەیری ئەسلی مەسەلەی مردوی دوەم بکە لەگەل بەشەکەی لە مردوی یەکەم بزانە چ پەیوەندیەکیان هەیە واتە توافقە ، تداخلە، تباینە .... .
- ئەگەر مەسەلەی مردوی دوەم لەگەل بەشەکەی لە مردوی یەکەم –تماثل – بێ ئەوا هیچ گۆرانکاری ئەوتۆی نابێ واتە هەرهەمان بەشەکەی کە لە مردوی یەکەمی وەرگرتوە بیکە بە ئەسلی مەسەلەی دوەم . ئەگەر توافق بوون ئەوا وفقی مەسەلەی مردوی دوەم لە تەواوی مەسەلەوبەشەکانی میراتگرانی مردوی یەکەم جاران دەکرێ بۆ ئەو میراتگرانەی کە لەهەردو مردوو میراتگرن ئینجا وفقی بەشی مردوی دوەم لەیەکە جارانی بەشی میراتگرانی دوەم بکە.
- ئەگەر تباین بوو ئەوا تەواوی مەسەلەی مردوی دوەم جارانی تەواوی مەسەلەی مردوی یەکەم لەگەل بەشەکانی میراتگرانی مردوی یەکەم دەکرێ بۆ ئەو میراتگرانەی کە لەهەردو مردوو میراتگرن ئینجا تەواوی بەشی مردوی دوەم لەیەکەم جارانی تەواوی میراتگرانی مردووی دوەم بکە. .

نمونە لەسەر حالەتی دووەم:–

پیاوێك مردووە لە پاشی بەجێماوە : ژن – کچ( لە ژنێکی تر) – مام ، پێش بەش کردنی میراتەکە کچەکە مرد و لەپاشی بەجێماوە ( مێرد – کور ) .

سەرەتا مەسەلەی مردووی یەکەم حەل دەکەین : ژنەکە هەشت یەکی هەیە چونکە منال هەیەو کچەکە نیوەی هەیەو چونکە تەنهایە و معصبی نیە وماوە بۆ مام بە عصبە بالنفس ، ئەصلی مەسئەلە لە ٨ چونکە هەشت و یەك و نیوە هەیە تداخلە ئینجا مەسەلەی مردوی دوەم حەل دەکەین کە کچەکەیە مردوە لەپاشی بەجیماوە میرد و کور ، میردەکە چواریەکی هەیە چونکە منال هەیە و ماوە بۆ کورەکە دەبی بە عصبە بالنفس واتە ئەصلی مەسئەلە لە ٤ چونکە چواریەك و ماوە هەیە میردەکە ١سهم و کورەکە ٣ سهم ئینجا سەیری نیوان ئەصلی مەسئەلەی مردوی دووەم بکە کە (٤) وە سەیری بەشی مردوی دوەم بکە لە مردوی یەکەم ئەویش (٤) کەواتە وەکو یەکن وە بەبی کەرت دابەش دەبی کەواتە مەسەلەی جامعە (٨) بۆ ژنی مردوی یەکەم (١سهم) و بۆ مامی مردوی یەکەم( ٣ سهم ) و بۆ میردی مردوی دووەم ( ١ سهم ) و بۆ کوری مردوی دوەم ( ٣ سهم ) .

| میراتگرانی مردووی یەکەم | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ژن | کچ | مام | مەسئەلە | الجامعە |
| ١/٨ | ١/٢ | ع | ٨ | ٨ |
| ١ | ٤ | ٣ | | |
| | | | | |
| میراتگرانی مردووی دووەم | | | | |
| مێرد | کور | مەسئەلە | | |
| ١/٤ | ع | ٤ | | |
| ١ | ٣ | | | |

نمونەیەکی تر لەسەر حالەتی دووەم:- پیاوێك مردوە لە پاشی بەجێماوە :﴿ ژن – ٢کچ (لە ژنیکی تر)- مام ﴾ میراتەکە بەش نەکرا تا کچێك مرد لەپاشی بەیما ﴿ مێرد – کور﴾

سەرەتا مەسەلەی مردووی یەکەم حەل دەکەین : ژنەکە هەشت یەکی هەیە چونکە منال هەیەو ٢کچەکە دوو سێیەکیان هەیەو چونکە ژمارەیان دووە و معصبیان نیە وماوە بۆ مام بە عصبە بالنفس ، ئەصلی مەسئەلە لە ٢٤ چونکە هەشت یەك و دوو سێیەك هەیە تباینە ئینجا مەسەلەی مردوی دوەم حەل دەکەین کە یەك لە کچەکان مردوە لەپاشی بەجیماوە میرد و کور ، میردەکە چواریەکی هەیە چونکە منال هەیە و ماوە بۆ کورەکە دەبی بە عصبە بالنفس واتە ئەصلی مەسئەلە لە ٤ چونکە چواریەك و ماوە هەیە میردەکە ١سهم و کورەکە ٣ سهم ئینجا سەیری نیوان ئەصلی مەسئەلەی مردوی دووەم بکە کە (٤) وە سەیری بەشی مردوی دوەم بکە لە مردوی یەکەم ئەویش (٨) کەواتە توافقە بە چواریەکئینجا چواریەکی چوار یەکە جارانی یەکەم و بەشەکان بکە هەروەك خۆی دەردەچێ کەواتە مەسەلەی جامعە (٢٤) وە چواریەکی بەشی مردوی دوەم لەیەکەم واتە چواریەکی ٨ دەکاتە دوو جارانی مەسەلەی دوەم و بەشەکان بکە : بۆ

**ژنی مردوی یەکەم (٣سهم) و بۆ کچە زیندوەکەی مردووی یەکەم (٨ سهم ) بۆ مامی مردوی یەکەم( ٥ سهم ) و بۆ میردی مردوی دووەم ( ٢ سهم ) و بۆ کوری مردوی دوەم ( ٦ سهم ) .**

| میراتگرانی مردووی یەکەم | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ژن | ٢کچ | مام | مەسئەلە | الجامعە |
| ١/٨ | ٢/٣ | ع | ٢٤ | ٢٤ |
| ٣ | ١٦ | ٥ | | |
| | | | | |
| میراتگرانی مردووی دووەم | | | | |
| مێرد | کور | مەسئەلە | | |
| ١/٤ | ع | ٢×٤ | | |
| ١×٢=٢ | ٣×٢=٦ | ٨ | | |

**نمونە لەسەر حالەتی سێیەم:**

**١- ژنێك مردووە لە پاشی بەجێماوە ﴿ مێرد - داك - کور - بنت ﴾پیش بەش کردنی میراتەکە کورەکە مرد لەپاشی بەجیما ئەوانەی لەمەسەلەی یەکەم ﴿باب - داپیر - خوشك ﴾ وە ﴿ ژن - کور ﴾**

**سەرەتا مەسەلەی مردووی یەکەم حەل دەکەین : مێردەکە چوار یەکی هەیە چونکە منال هەیەو داك: شەش یەکی هەی چونکە منال هەیە و ماوە بۆ کچەکەو کورەکە للذکر مثل حظ الانثیین، ئەصلی مەسئەلە لە ١٢ چونکە چواریەك و شەش یەك هەیە توافق بە نیوەیەبەلام بەشی کورو کچەکە تباینە بۆیە ٣ جارانی ئەصلی مەسئەلەو بەشەکان دەکەین ٣×١٢=٣٦ بۆ میردەکە ٩سهم و بۆ دایکەکە ٦ سهم و ماوە ٢١ سهم بۆ کورەکە ١٤ و بۆ کچەکە ٧ سهم ئینجا مەسەلەی مردوی دوەم حەل دەکەین کە کورەکە مردوە لەپاشی بەجیماوە ژن و کور و باب و داپیر و خوشك لەداك وباب ، ژنەکەکە هەشت یەکی هەیە چونکە منال هەیە و باب شەش یەکی هەیە و داپیر شەش یەکی هەیە و ماوە بۆ کورەکە دەبی بە عصبە بالنفس و خوشکەکە بیبەشە بە باب و کور واتە ئەصلی مەسئەلە لە ٢٤ چونکە هەشت یەك و شەش یەك هەیە ژنەکە٣سهم وباب ٤سهم و داپیر٤سهم وماوە بۆ کورەکە ١٣ سهم و خشکەکە بیبەشە بە باب و کورئینجا سەیری نیوان ئەصلی مەسئەلەی مردوی دووەم بکە کە (٢٤) وە سەیری بەشی مردوی دوەم بکە لە مردوی یەکەم ئەویش (١٤) کەواتە توافقە بە نیوە ئینجا نیوەی مەسەلەی دوەم کە ١٢ جارانی مەسئەلەی یەکەم ٣٦و بەشەکان بکە ١٢× ٣٦ = ٤٣٢ وە نیوەی بەشی مردوی دوەم لەیەکەم واتە نیوەی ١٤ دەکاتە ٧ جارانی مەسەلەی**

دوەم و بەشەکان بکە : بۆ ژنەکە (٢١سهم) وبۆ باب ٢٨ سهم و بۆ داپیر ٢٨ سهم و ماوە بۆ کورەکە ٩١ سهم مەسئەلەی جامعە لە ﴿ ٤٣٢﴾ دەردەچی بەم شیوەیە :

مێردی مردووی یەکەم: ١٠٨ سهم کە هەمان باوکە لە مردوی دوەم واتە ٢٨+ سهم لە مردوی دوەم =١٣٦ سهم .

داکی مردووی یەکەم ٧٢ سهم همان داپیرە لە مردوی دوەم ٣٨ سهم واتە ﴿ ١٠٠ سهم ﴾

کچی مردوی یەکەم ٨٤ سهم بەلام لە مردوی دوەم نیەتی .

ژنی مردووی دووەم ٢١ سهم

کوری مردووی دوەم ٩١ سهم

| میراتگرانی مردووی یەکەم | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| میرد | داك | کچ | کور | مەسئەلە | الجامعە |
| ١/٤ | ١/٦ | ع للذکر مثل حظ الانثیین | | ٣×١٢ | ٤٣٢ |
| ٩=٣×٣ | ٦=٣×٢ | ٢١=٣×٧<br>٧ | ١٤ | ١٢×٣٦ | |
| ١٠٨=١٢×٩ | ٧٢=١٢×٦ | ٨٤=١٢×٧ | مردووە | ٤٣٢ | |
| میراتگرانی مردووی دووەم | | | | | |
| ژن | باب | داپیر | کور | خوشك لەد.ب | مەسئەلە |
| ١/٨ | ١/٦ | ١/٦ | ع | بیبەشە | ٧×٢٤ |
| ٢١=٧×٣ | ٢٨=٧×٤ | ٢٨=٧×٤ | ٩١=٧×١٣ | ٠ | ١٦٨ |

نمونەیەکی تر :پیاویك مردووە لەپاشی بەجێماوە ﴿ ژن – کور – کچ ﴾ پیش دابەش کردنی میرات کچەکە مرد تەنها ئەوانەی لەپاش بەجیما کە میراتگری مردوی یەکەمن.

سەرەتا مەسەلەی مردووی یەکەم حەل دەکەین : ژنەکە هەشت یەکی هەیە چونکە منال هەیەو ماوە بۆ کچەکەو کورەکە للذکر مثل حظ الانثیین، ئەصلی مەسئەلە لە ٨ چونکە هەشت یەك و ماوە هەیە بەشی کورو کچەکە تباینە بۆیە ٣ جارانی ئەصلی مەسئەلەو بەشەکان دەکەین ٣×٨=٢٤ بۆ ژنەکەکە ٣سهم و ماوە ٢١ سهم بۆ کورەکە ١٤ و بۆ

کچەکە ٧ سهم  ئینجا مەسەلەی مردوی دوەم حەل دەکەین کە کچەکە مردوە لەپاشی بەجیماوە میراتگرانی مردوی یەکەم واتە داك وبرایەکی لەداك وباب ، داکەکە سێیەکی هەیە چونکە مردوەکە منالی نیەو لە برایەك زیاتری نیە و ماوە بۆ کورەکە دەبی بە عصبە بالنفس و خوشکەکە بیبەشە بە باب و کور واتە ئەصلی مەسئەلە لە ٣ بۆ دایکەکە ١ سهم وماوە بۆ کورەکە ٢ سهم ئینجا سەیری نیوان ئەصلی مەسئەلەی مردوی دووەم بکە کە (٣) وە سەیری بەشی مردوی دوەم بکە لە مردوی یەکەم ئەویش (٧) کەواتە تباینە ئینجا تەواوی مەسەلەی دوەم کە ٣  جارانی مەسئەلەی یەکەم ٧ وبەشەکان بکە ٣× ٢٤ = ٧٢ وە تەواوی بەشی مردوی دوەم لەیەکەم واتە ٧ جارانی مەسەلەی دوەم و بەشەکان بکە : بۆ داکەکە ١×٧=٧ سهم و ماوە بۆ کورەکە ٢×٧=١٤ سهم :مەسئەلەی جامعە لە ﴿ ٧٢﴾ دەردەچی بەم شیوەیە :ژنی مردوی یەکەم کە دایکی مردوی دوەمە لە مردوی یەکەم٩سهم ولەمردوی دوەم ٧ سهم واتە ١٦ سهمی هەیە کورەکە لە مردووی یەکەم کە برای مردوی دوەمە ٤٢+١٤ = ٥٦ سهمی هەیە.

| میراتگرانی مردووی یەکەم | ژن | کور | کچ | مەسئەلە | راستکردنەوە | مەسئەلەی جامعە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | ١/٨ | للذکر مثل حظ الانثیین | | ٨ | ٣×٨ | |
| | ٣×١ | ٣×٧ | | | ٢٤ | ٣×٢٤ |
| | ٣×٣ | ٣×١٤ | ٧ | | | ٧٢ |
| | ٩ | ٤٢ | ٢١ مردووە | | | |

| میراتگرانی مردووی دوەم | داك | برا لەداك وباب | مەسئەلە |
|---|---|---|---|
| | ١/٣ | ماوە | ٧×٣ |
| | ٧=٧×١ | ١٤=٧×٢ | ٢١ |

نمونەیەکی تر: پیاوێك مردووە لەپاشی بەجێماوە ﴿ ژن – داك – کچ – خوشك لە داك وباب ﴾ پیش ئەوەی میراتەکە بەش بکرێ ژنەکە مرد لەپاشی بەجیما ئەوانەی یەکەم وە (میرد – کور ) :–

سەرەتا مەسەلەی مردووی یەکەم حەل دەکەین : ژنەکە هەشت یەکی هەیە چونکە منال هەیەو داکەکە شەش یەکی هەیەو چونکە منال هەیە و کچەکە نیوەی هەیە چونکە بە تەنهایەو عەصەبەی نیە و ماوە بۆ خوشکەکەی لە داك وباب ، ئەصلی مەسئەلە لە ٢٤ چونکە هەشت یەك وشەش یەك هەیە توافقە بە نیوە  ئینجا مەسەلەی مردوی دوەم حەل دەکەین کە ژنەکە مردوە لەپاشی بەجیماوە میرد و کچ و کور ، میردەکە چواریەکی هەیە چونکە منال هەیە و ماوە بۆکچەکەو کورەکە دەبی بە لـلژکر مپل حڤ الانپیین واتە ئەصلی مەسئەلە لە ٤ چونکە چواریەك و ماوە هەیە میردەکە ١سهم و کچەکە ١ سهم و کورەکە ٢ سهم ئینجا سەیری نیوان ئەصلی مەسئەلەی مردوی دووەم بکە کە (٤) وە سەیری بەشی مردوی دوەم بکە لە مردوی یەکەم ئەویش (٣) کەواتە تباینە بۆیە تەواوی ئەصلی دوەم کە چوارە جارانی یەکەم و

**بەشەکان بکە بەم شیوەیە : ئەصلی مەسئەلە ٢٤×٤= ٩٦ کە بریتی یە لـە مەسئەلـەی جامعە ، بەشی ژن ٣×٤=١٢ ، بەشی داك ٤×٤=١٦ ، بەشی کچ ١٢×٤= ٤٨ ، بەشی خوشك لـە داك وباب ٥×٤=٢٠، ئینا تەواوی بەشی مردوی دوەم لـەیەکەم واتە ٣ جارانی مەسەلـەی دوەم و بەشەکان بکە واتە : مەسەلـە : ٤×٣= ١٢ ، بەشی مێرد ١×٣=٣ ، بەشی کچ: ١×٣=٣ ، بەشی کور ٢×٣=٦ .**

| میراتگرانی مردووی یەکەم | ژن | داك | کچ | خوشك لە د.ب | مەسئەلـە | مەسئەلـەی جامعە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | ١/٨ | ١/٦ | ١/٢ | ماوة | ٢٤ | ٢٤×٤ |
| | ٤×٣ | ٤×٤ | ٤×١٢ | ٤×٥ | | ٩٦ |
| | ١٢ | ١٦ | ٤٨ | ٢٠ | | |

| میراتگرانی مردووی دوەم | میرد | کچ | کور | مەسئەلـە |
|---|---|---|---|---|
| | ١/٤ | للذكر مثل حظ الانثيين | | ٤ |
| | ٣=٣×١ | ٣=٣×١ | ٦=٣×٢ | ١٢=٣×٤ |

==================================================

# میراتی – الحمل –

# کۆرپە

<u>پێناسەی الحمل:–</u> لە رووی زمانەوە قورسایەتی لە سکی ئافرەت .لەرووی زاراوە شەرعی ئەوکۆرپەی ناوسکی ئافرەتە کە میرات دەگری یان کاردەکاتە سەر میراتگرەکانی تر بە هاتنە سەر دونیا.

<u>مەرجی الحمل لە میرات :–</u>

دوو مەرجی هەیە:

١– بزانری کەوا بونی هەبوە لەکاتی مردنی باوکەکەی ئەوەش بە دوو شیوە دەزانری ئەگەر منالەکە بەشەش مانگی بوە کە ئافرەتەکەش لای میردی بوە لەوکاتە . شیوەی دوەم یان لە ماوەی زۆرترینی حەمل یان کەمتر ئەگەر ئافرەتەکە لای میردی نەبوە یان لای بوە لەبەر هۆکاریك لەگەڵی کۆ نەبوتەوە وەك دورکەوتنەوە یان چودا بونەوە .

٢– کاتی کە دەبیٚ بە زیندویی لەدایکی بیٚ و ژیانی هەبوبی ئەمەش بە بۆچونی حەنەفیەکان ئەوەیە بە موتلەقی حەرەکەو جولەی هەبی کە دەبی بەلام بەلای شافعی و حەنبەلیەکان جولەیەکی درێژی هەبێت وە مالکیەکان دەڵین دەنگی لێوە بێت بە گریان وە یان مشتنی مەمك .

کەواتە بۆمان دەرکەوت گرنگ وایە کە منالەکە دەبی پێویستە دەنگی لێوە بیت بەگریان یان هاوار کردن وەیان جولەیەکی درێژ، بەلام جولەیەکی کەم و نەفەسیکی کەم مانای ژیان نادات .

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی : اذا استهل المولود صارخا ورث وان لم یستهل صارخا لم یرث) رواه اصحاب السنن .واتە ئەگەر لەدایك بوەکە هاتە سەردونیا و دەنگی لیوە هات میرات دەگری ئەگەر بەبی دەنگی بیت ناگری _ واتە بە مردویی بوە .

قەولی راجح: قسەی جمهورە جگە لە حەنەفیەکان .

ئایا زۆرترین ماوەو کاتی حەمل چەندە لەلایەن شەرع زانان؟

قەولی یەکەم:– سنوری زۆری بۆ نیە بەلکە دەگەریتەوە بۆ عورفی شوینەکە ئەمەش بە بۆچونی قورتبی و ابن القیم وابن باز و ابن عثیمین .

قەولی دووەم:– ٢سال

**قەولی سێیەم : ٣ سال**

**قەولی چوارەم : چوارسال**

**قەولی پینجەم : ٥ سال**

**قەولی شەشەم: حەوت سال**

**قەولی حەوتەم: ٩ مانگ ئەمە قەولی زاهیریەکانە**

**قەولی هەشتەم:- ١٠ مانگە ئەوەش قەولی دکتۆرەکان وزۆرینەی زانایانی هاوچەرخ و سەردەم.**

**قەولی راجح:- کۆکردنەوەی نێوان قەولی یەکەم و هەشتەمین زۆرینەی حمل بۆ عورف دەگەریتەوە وە عورفی ئەم سەردەمەش زۆرینەکەی ١٠ مانگە چونکە ئەگەر لە دەمانگ زیاتر کۆرپەلە بمینیتەوە دکتۆرەکان دەلین بە زۆری وایە دەمرێ.**

**<u>حوکمی دابەش کردنی میرات کاتیك حەمل هەبێ:-</u>**

**دیارە کە زانایان لەم بارەوە سێ قەولیان هەیە :-**

**<u>قەولی یەکەم:-</u> قەولی حەنەفیەکان و هەندی لە زانایان ئەوەیە : میراتەکە ی کە حەملی تیدایە دابەش ناکرێ هەتا حەملەکە رۆن دەبێتەوە چونکە نازانری جۆری کۆرپە و ژمارەکەی.**

**<u>قەولی دووەم:-</u> قەولی حەنبەلیەکان و هەندی لە زانایان ئەوەیە : ئەگەر هاتوو میراتگرەکان ریك کەوتن لەسەر چاوەروانی کردن تا منالەکە دەبی ئەوە باشترە وە ئەگەر ناکۆك بوون هەندیکیان داوای بەش کردنیان کرد و توشی زەرەرو زیان نەدەهاتن بەچاوەروان کردن و میراتەکە دابەش دەکری بە بە شەش گریمان ( لەناوپاش باسی دەکەین ) کەچی ئەبو حەنیفە رەحمەتی خوای لەسەربی تەنها دوو گریمان دادەنی بۆ حەمل : نیر و مێ.**

**<u>قەولی سێیەم:-</u> ئەگەر ماوەی بونی منالەکە نزیك بوو دابەش ناکری تا منالەکە دەبی ئەوە بۆچونی هەندی لە حەنەفیەکانە وە جیاوازن لە ماوەی نزیك کە چەندە ئەوەش چەند قەولیکیان هەیە .**

**<u>حالەتەکانی میراتگر لەکاتی هەبونی حمل:-</u>**

**حالەتی یەکەم :- بەهەموو تەقدیراتەکانی حمل بەشی میراتگرەکان ناگۆرێ بە هەبون و نەبون و نیرو میی حەملەکە ئەوە میراتگرەکە بەشی تەواوی خۆی وەردەگرێ .**

حالەتی دووەم:- میراتگر بێبەش دەبی لەهەندەك تەقدیراتی حەمل ئەوە لەو حالەتەكە میراتگرەكە هیچ وەرناگری تا منالەكە دەبی .

حالەتی سێیەم:- بەشی میراتگر كەم دەكات بەتەواوی بیبەش نابی بە هەبونی حەمل ئەمە لەو حالەتە بەشە كەمەكەی پیّ دەدریّ.

## هەنگاوەكانی شیكردنەوەی میراتی حەمل:-

١- بۆ حەملەكە شەش گریمان و تەقدیر دادەنریّ: مردووە - نێرە - مێیە - دوانەی نێرینەن - دوانەی مێینەن - دوانەن نێر و میّ .

٢- هەر شەش مەسئەلە واتە بەشەش تقدیر حەل دەكەین واتە شەش مەسئەلە دروست دەكەین بە تصحیحەوە گەر پیویستی بە تصحیح بێت .

٣- سەیری نیوان هەر شەش ئەصلە مەسئەلە دەكەین لەو چوار ریژەیەی باس كراوە ( توافق - تباین - تداخل - تماثل ) چیان لە نیوانە بۆ دەرهینانی ئەصلی مەسئەلە ی جامعە .

٤- مەسئەلە جامعە دابەشی سەر ئەصلی مەسئەلەكان بكە تا بەشیكی سهم دەرچی.

٥- ئەو بەشەی كە دەرچوە جارانی بەشی میراتگرەكان بكە هەربەشەو لە مەسئەلەی خۆی تا بەشیان دیار كەوی لە مەسئەلەی جامعە

٦- سەیری نیوان بەشەكان دەكەین لە هەر شەش مەسئەلە :

- ئەگەر بەشی میراتگرەكە نەدەگۆرا بە حمل ئەوا بەشی میراتگرەكە بە تەواوی دەدریّ .
- ئەگەر بەشی میراتگر دەگۆرا بە حمل ئەوا كەمترین بەشی پی دەدری .
- ئەگەر میراتگرەكە لەهەندەك تەقدیراتان بیبەش دەبو لە شەشەكان ئەوا هیچی پی نادریّ.

٧- ئینجا ئەوەی راگیراوە دەردەهینین ئەمەش بە كۆكردنەوەی بەشەكانی میراتگرەكان لەژیر مەسەلەی جامعە دیاری دەكەین پاشان ئەو ژمارە لە ئەصلی امعە دەردەكەین .

٨- ئەوەی راگیراوە دابەشی سەر حەمل و میراتگرەكانی تر دەكەین ئەگەر هەبن.

**چۆنیەتی دابەش کردنی بەشە راگیراوەکە :-**

**سەبارەت بە حەمل لەکان لەشەش تەقدیرەکان بۆی دەرچوو بەشی تەواوی پی دەدرێ ئەگەر هەموو راگیراوەکە بیت ئەوە تەواو  و ە ئەگەر ماوە هەبوو دابەشی سەر ئەوانی تر دەکری .... واتە سەیردەکەین هەریەك لە میراتگرەکان چەندی هەیە لە تەقدیرەکەی کە بۆ حمل دەرچوە وە لە جامعە چەندی هەیە ئەگەر ئەوەی جامعە و تەقدیری حومل وەکو یەك بون ئەوا هیچی بۆ زیاد ناکری چەندە هەر ئەوەندە، ئەگەر ریژەکان جیاواز بوون ئەوا فەرقەکەی لە راگیراوەکە پیی دەدری هەرچەندە لە جامعەش لە هەندەك حالەتان بیبەش دەبی کەواتە ئەوەی پی دەدری کە شایەنیەتی لە راگیراوەکە لەو تەقدیرەی بۆ حەملەکە دانراوە .**

**دوو ئاگاداری :**

**١- هەندی لە زانایانی میرات ئەگەر لەبەشی حمل کەرت دەرچی تصحیح ناکات چونکە دەلێن کە رۆن بۆوە حەمل چیە پیویست بە تصحیح ناکات .بەلام ئیمە بەپیچەوانەوە تصحیحی دەکەین تا فیری بین .**

**٢- هەندی لە زانایان بەم شیوە مەسئەلەی حمل شی دەکەنەوە :بەشی حەملەکەی دوو نیر یان دوو می رادەگرن و بەشە زۆرەکە بۆ حمل دادەنری چونکە بونی دووانە زۆرە تەقدیراتەکانی تریش داخلی ئەمەن .**

**نمونە :- پیاوێك مردوە لەپاشی بەجیماوە ژنێکی حامل و برایەکی لەداك وباب :-**

| | ٤ | | ٦ | ٨ | | ٣ | ٨ | | ٣ | ٨ | | ٣ | ٢٤ | | ١ | ٨ | | ٣ | ج ٢٤ | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ژن | ١/٤ | ١ | ٦ | ٨\١ | ١ | ٣ | ٨\١ | ١ | ٣ | ٨\١ | ١ | ٣ | ٨\١ | ٣ | ٣ | ٨\١ | ١ | ٣ | ٣ | ٣ | – | – | – | – |
| برا | ب | ٣ | ١٨ | – | – | – | ب | ٣ | ٩ | – | – | – | ب | ٥ | ٥ | – | – | – | – | ١٨ | – | ٩ | – | – |
| حمل | – | – | – | ب | ٧ | ٢١ | ٢\١ | ٤ | ١٢ | ب | ٧ | ٢١ | ٣\٢ | ١٦ | ١٦ | ب | ٧ | ٢١ | – | – | ٢١ | ١٢ | ٢١ | ٢١ |
| تقدیر | مردووه | | | نیر | | | مێ | | | دو نێر | | | دومێ | | | نیر ومی | | | ٢١ موق | مر | ن | می | ن ن | ن م |

---

# میراتی - مفقود -

**مفقود : بەو کەسە دەگوترێ کە بزربوە و نازانرێ لە ژیان دا ماوە یان مردووە.**

ماوەی چاوەڕوان کردنی مفقود:- زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی کە پێویستە ماوەیەك چاوەڕوان بکرێت تاوەکو حاڵی ڕۆن دەبێتەوە بەمان و نەمانی مفقود بەڵام لە دیاری کردنی ئەندازەی ماوەی دیاری کراودا جیاوازن :-

قەولی یەکەم:- تەقدیر کردنی ئەو ماوەیە دەگەڕێتەوە بۆ اجتهادی حاکم دەربارەی حاڵ و چۆنیەتی مفقود

قەولی دووەم:- پێویستە لە دانانی ماوەیەکی دیاری کراو :-

- لەلای مەزهەب ابو حنیفە چاوەڕوانیەکەی تا ئەو ماوەیە کە هاوتەمەنەکانی مفقود هەمووی مردون و نەماون .
- مەزهەبی مالکیەکان: چاوەڕوان دەکری تا تەمەنی مفقود دەگات بە حەفتا ساڵ لە ڕۆژی لەدایك بونیەوە تاوەکو بزربونی لەبەر فەرموودەی پیغەمبەر صلی الله علیه وسلم ( اعمار امتي ما بين الستين والسبعين وقليل من يجاوز ذلك )
- وە بەلای مەزهەب شافعیەکان و هەندی لە حەنەفیەکان : چاوەڕوان دەکری تاوەکو تەمەنی دەبی بە نەوەت ساڵ لەڕۆژی مردنی تا بزربونی .

قەولی سێیەم:- قەولی حەنبەلیەکانە :-

- ئەگەر مفقود بۆ گەشتیك دەرچو بو کە بەزۆری وایە گەشتەکە شوین ترس نیە واتە گەشتەکە سەلامەتیە وەکو چون بۆ فیربونی زانست و خویندن یان بازرگانی ئەوە چاوەڕوان دەکری تا تەمەنیان نەوەت ساڵ تەواو دەکات لە رژی لە دایك بونیەوە .
- وە ئەگەر غالب وایە گەشتەکەی هەلاکەت و ترسی مردنی تیایە وەکو شەر یان سەردەمی روداوی ناخۆش و ویران کاری یە ئەوە لەماوەی بزر بونی تا چوار ساڵ چاوەڕوان دەکری چونکە صحابەکان بەم بریارەیان کردوە بۆ خیزانی مفقود تا چوارساڵ دانیشی و چاوەڕوان بی .

وە راجح لەو قەولانە قەولی قەولی یەکەمە واتە بۆ اجتهادی حاکم دەگەڕیتەوە و بریار بۆ حاکم دەبی.

## حاڵەتەکانی میراتی مفقود

مفقود سێ حاڵەتی هەیە :-

یەکەم:- مفقود ئەوکەسەیە کە میراتی لی دەگیری واتە خاوەن میراتەکە خۆیەتی ئەمە میراتەکەی بەش ناکری تا ڕۆن دەبێتەوە یان ماوەی دیاری کراو کۆتایی دێت یان قازی بریاردەردەکا بە مردنی مفقود.

دووەم : مفقود تاکە میرات گری مردوەکەیە : ئەمەش میرتاتەکەی پێ نادرێ تا ڕۆن دەبێتەوە یان بریاری قازی دەردەکری بە مردنی مفقود.

سێیەم:- مفقود یەکێکە لە میراتگرەکان : ئەگەر میراتگرەکانی تر رێك کەوتن لەسەر چاوەروانی کردن تا حالی مفقود رۆن دەبیتەوە ئەوە چاوەروان دەبن ، وە ئەگەر ریك نەکەوتن لەسەر چاوەروانی ئەوا ئیجبار ناکرێن بەلکو میراتەکە دابەش دەکەن و دوو حالـەتی بۆ تقدیر دەکری یان زیندوە یان مردوە وە بۆ میراتگرەکان کەمترین بەشی پیێ دەدریێ و ماوە رادەگیریێ تا رۆن بونەوەی حالی مفقود .

## حوکمی بەشە راگیراوەکە پاش تەواو بونی ماوەی دیاری کراو یان حوکمی حاکم

سیێ حالـەتی هەیە :-

یەکەم: وادائەنریێ کە مفقود لـەکاتی بەش کردنی میرات زیندوە ئەوە میراتگرە بە اتفاق و بەشەکەی دیاری دەکری

دووەم: وا دائەنریێ کە مردووە لـەکاتی بەش کردنی میرات ئەمەش بە اتفاق میراتی نیەو راگیراوەکە دەدریتەوە میراتگرەکانی تر

سێیەم: نەزانری کە ماوە یان مردوە ئەمەش دەکریێ بە دوو قەولـەوە لەلای ئەهلی علم ارجح وایە میراتی نیە و راگیراوەکە بۆ میراتگرەکانی ترە وە هۆکارەکەش ئەوەیە میرات جێگیر نابیێ بە گومان بەلکو بە یەقین.

## هەنگاوەکانی حەل کردنی مەسئەلـەی مفقود

١. بۆ مفقود دوو تەقدیر دائەنریێ: ﴿ زیندوو ، مردوو ﴾ هەرمەسئەلـەو بەشێوەیەکی ئاسایی حەل دەکەین
٢. بۆ دەرهینانی مەسئەلـەی جامعە سەیری نیوان هەردوو مەسئەلـە دەکەین بە چوار ریژەکە.
٣. مەسەلـەی جامعە دابەشی سەر ئەصلی هەریەك لـە دوو مەسئەلـەکە دەکەین و ئەوەی دەردەچی بریتی یە لـە بەشیکی سەهمی ئەو مەسئەلـە.
٤. بەشە سەهمە دەرچوەکە جارانی مەسەلـەکەی دەکەین تا بەشی هەموان دەربچیێ
٥. سەیری نیوان بەشی میراتگرەکان دەکەین لـەهەردوو مەسئەلـە :

أ- ئەگەر میراتگرەکە لـەهەردوو مەسئەلە بەکەی وەکو خۆیەتی بەهەبون و نەبونی مفقود ئەوا بەشی تەواوی خۆی وەردەگریێ

ب- ئەگەر کەم و زیادی دەکرد بەشە کەمەکەی پیێ دەدریێ

ت- ئەگەر لـەهەردوو مەسئەلـەکە بیبەش دەبو یان لـەیەکیان بیبەش دەبوو ئەوا هیچی پیێ نادریێ . وماوەکە رادەگیریێ هەتا حالی مفقود رۆن دەبێتەوە جا کە شایەنی بوو پیی دەدری ئەگەر نا بۆ خاوەن مافەکانی تر دەگەرێندریتەوە

٦. دەرهینانی ماوە راگیراوەکە وەك لـە میراتی حەمل باس کرا واتە بەشی میراتگرەکان کۆدەکەینەوە لـە ژێر مەسئەلـەی جامعە پاشان ئەنجامەکە لـە جامعە دەردەکەین ئەوەی ماوە راگیراوەکەیە.

نمونه:- پیاویك مردووه لـه پاشی بەجیماوه ﴿ ژن – كوریكی مفقود – برایەكی لـه داك وباب ﴾

| | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | ٤ | | ٨÷٤=٢ | ٨ | | ٨÷٨=١ | جامعه(٨) | | |
| ژن | ٤\١ | ١ | ١×٢=٢ | ٨\١ | ١ | ١×١=١ | ١ | ١ | ٠ |
| كور مفقود | ٠ | ٠ | ٠×٢=٠ | ب | ٧ | ٧×١=٧ | ٠ | ٠ | ٧ |
| براله د.ب | ب | ٣ | ٣×٢=٦ | ٠ | ٠ | ٠×١=٠ | ٠ | ٦ | ٠ |
| تقدير | مردوه | | | زيندوه | | | ٨-١=٧ راگيراو | | |

نمونه : ژنیك مردووه لـه پاشی بەجیماوه : ﴿ میرد – برایەكی لـەباب مفقود – خوشكیكی لـەباب ﴾

| | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | ٢ | | ٦÷٢=٣ | ٢×٣=٦ | | ٦÷٢=٣ | | جامعه(٦) | | |
| مێرد | ٢\١ | ١ | ١×٣=٣ | ٢\١ | ١ | ١×٣=٣ | | ٣ | ٠ | ٠ |
| برالـەب مفقود | ٠ | ٠ | ٠×٣=٠ | ب | ١ | ١×٣ | ٢ | ٠ | ٠ | ٢ |
| خوشك لـه ب | ٢\١ | ١ | ١×٣=٣ | | | | ١ | ١ | ٢ | ٠ |
| تقدير | مردوه | | | زيندوه | | | | ٦-٤=٢ راگيراو | | |

==============================================================

# میراتی نێرەمووك ﴿ الخنثى ﴾

**نێرەمووك : بە كەسە دەگوترێ كە ئالـەتی نیر و ئالـەتی مێینەی هەیە یان نە بە نیر دەچی و نە بە مێ.**

**نێرەمووك دوو لایەنی هەیە:**

**ئەو لایەنەی كە تصور دەكری نیرەمووك بێ:**

- **لایەنی منال**
- **لایەنی خوشك وبرا**
- **لایەنی مام**

**ئەو لایەنەی تصور ناكری نیرەموك بیت :**

- **لایەنی باوكایەتی**
- **لایەنی دایكایەتی**
- **لایەنی هاوسەری**

## بەشەكانی نیرەمووك

**بەشی یەكەم:- نیرەمووكی بی كیشە :**

**ئەوەیە كە نیشانەی پیاو یان ئافرەتی لی بەدی دەكری یان حالـەكەی رۆن و ئاشكرایە ئەم جۆرە بریاری ئەو لایەنەی بۆ دەدری كە نیشانەی ئەو لایەنی پیوەدیارە ئەگەر نیشانەی نیر بی میراتی نیری دەدریتی وە ئەگەر مێ بی میراتی میی پی ئەدرێ**

**بەشی دووەم : نیرەمووكی بە كێشە: ئەوەیە كەنیشانەی دیار نیە كە بتوانری بریاری لایەنیكی بۆ بدری ، ئەمەیان دوو حالـەتی هەیە :-**

- ✓ **ئومێدی رۆن بونەوەی حالـەكەی كە نیرە یان مێ ئەمەشیان كە بچوكە و منالـە هیشتا بلـوغی نەبوە.**
- ✓ **ئومێدی رۆن بونەوەی نیە ئەوەشیان بە منالی مردوە یان بلـوغی بوە و نیشانەی نێر و مێی دیار نەكەوتوە .**

## نيشانەكانى رۆن كردنەوەى نيرەموك

١- نيشانەنەكانى تەمەنى منالى:- تەنها بە هۆى ميز كردنەوە دەزانرى گەر شوينى ميزكردنەكەى هەمان شوين ميزى نيرينەى ئاسايى بيت ئەوا نيرە ئەگەر شوين ميزى مێينە بيت ئەوا مىٚ يە وە ئەگەر بەهەردوو شوين ميزى دەكرد عيبرەت بەو شوينى كە يەكەم جار ديتە خوارەوە .

٢- نيشانەكانى گەورەيى و پاش بالغ بوون :﴿ ريش ( ردێن )- بەر - بەدەركەوتنى حەيز - دەرچونى مەنى لە زەكەرى - دەركەوتنى مەمك ﴾

## حالەتەكانى ميراتى نيرەمووك

پێنج حالەتى هەيە:-

يەكەم:- بە اتفاقى زانايان ميراتى نيە چونكە بێبەشە بۆيە هەبون و نەبونى هيچ كيشە دروست ناكات .بۆ نمونە هەبونى براى نيرەموك لەگەل كورى مردوەكە لەم حالەتە نيرەموك بيبەشە لەبەر هەبونى كور

دووەم:- بە اتفاق ئەگەر تاكە ميراتگر بيت ئەوە هەموو ميراتەكە هى ئەوە .

سێيەم : بە اتفاق بەهەر تەقديريك بيت ميراتەكەى ناگۆرى هەر هەمان بەشە نير بى يان مى وەكو ئەوە نيرەموك لەداكى مردوەكە يان برا لە داكە يان خوشك لەداكە يەك بيت شەش يەكە و دوو بن سێيەكە .

چوارەم:- بەيەك لەدوو تەقدير ميراتى بەردەكەوى بە تەقديرەكەى تر بيبەشە بۆ نمونە برازايەكى مردوەكە نيرەموكە ئەگەر نير بى ميراتگرە و ئەگەر مىٚ بىٚ لە خاوەن رەحمە و ميراتگر نيە .

پێنجەم:- بە هەردوو تەقديرى نير و مى دەگرى بەلام يەكيان زۆرە و ئەوەى تر كەمە وەكو منالى كورى مردوەكە نيرە موكە گەر نير بى زياترە عصبەيە و گەر مىٚ بى كچى كورە و بەشى ديارى كراوى هەيە .

**ئاگادارى:-** لە حالەتى چوارەم و پێنجەم زانايان راى جياوازيان هەيە لەهەموان باشتر ئەوەيە :

ئەگەر هاتوو ئومێدى رۆن بونەوەى حالى هەبيت ئەوە لاى كەمەكە بۆ ميراتگرەكانى تر ديارى دەكرى تا رۆن دەبێتەوە و ماوە رادەگيرى تا ئاشكرابونى حالەتەكە جا ئەگەر كەشف بوو ئەوا يان ماوەكە دەبات يان دەدريتەوە ميراتگرەكان . وە ئەگەر ئومێدى كەشف و ئاشكرابونى حالى نيرەموك نەبوو ئەوا نيوەى بەشەكەى پى دەدرى بە نيرە موك هەروەها ئەوانەى تريش نيوەيان پى دەدرى نەوەك بەشى تەواويان ئەمەش بۆچونى مالكى و حەنبەليەكانە .

## ڕێگای حەل کردن بەهەردوو حالەت

حالەتی یەکەم:- نیرەموکی موشکیلە ئومیدی دیار بون و کەشفی حالی نیە جا نیرەموك و ئەوانی تر بەکەمترین بەش مامەلەیان لەگەل دەکریَ بەم شیوەیە :

١- بۆ نێرەموك دوو تەقدیر دائەنریَ: ﴿ نیر ، میَ ﴾ هەرمەسئەلەو بەشێوەیەکی ئاسایی حەل دەکەین

٢- بۆ دەرهینانی مەسئەلەی جامعە سەیری نیوان هەردوو مەسئەلە دەکەین بە چوار ریژەکە.

٣- مەسەلەی جامعە دابەشی سەر ئەصلی هەریەك لە دوو مەسئەلەکە دەکەین و ئەوەی دەردەچی بریتی یە لە بەشیکی سەهمی ئەو مەسئەلە.

٤- بەشە سەهمە دەرچوەکە جارانی مەسەلەکەی دەکەین تا بەشی هەموان دەربچیَ

٥- سەیری نیوان بەشی میراتگرەکان دەکەین لەهەردوو مەسئەلە :

ا- ئەگەر میراتگرەکە لەهەردوو مەسئەلە بەکەی وەکو خۆیەتی بەهەبون و نەبونی نیرەموك ئەوا بەشی تەواوی خۆی وەردەگریَ

ب- ئەگەر کەم و زیادی دەکرد بەشە کەمەکەی پیَ دەدریَ

ج- ئەگەر لەهەردوو مەسئەلەکە بیبەش دەبو یان لەیەکیان بیبەش دەبوو ئەوا هیچی پیَ نادریَ . وماوەکە رادەگیریَ هەتا حالی نیرەموك رۆن دەبیّتەوە جا کە شایەنی بوو پیی دەدری ئەگەر نا بۆ خاوەن مافەکانی تر دەگەرێندریتەوە

٦- دەرهینانی ماوە راگیراوەکە وەك لە میراتی حەمل باس کرا واتە بەشی میراتگرەکان کۆدەکەینەوە لە ژێر مەسئەلەی جامعە پاشان ئەنجامەکە لە جامعە دەردەکەین ئەوەی ماوە راگیراوەکەیە.

حالەتی دووەم:- ئەو نێرەمووکەی موشکیلە و ئومیدی رۆن بونەوەی حالی نیە ئەوا نیرەو موك و ئەوانی تریش نیوەی بەشیان دەدریتی کە شایستەیانە

١- بۆ نێرەموك دوو تەقدیر دائەنریَ: ﴿ نیر ، میَ ﴾ هەرمەسئەلەو بەشێوەیەکی ئاسایی حەل دەکەین

٢- بۆ دەرهینانی مەسئەلەی جامعە سەیری نیوان هەردوو مەسئەلە دەکەین بە چوار ریژەکە ئەنجامەکەی پیی دەگوتری - الجامعە الصغری - .

٣- مەسەلەی جامعە ی صغری دابەشی سەر ئەصلی هەریەك لە دوو مەسئەلەکە دەکەین و ئەوەی دەردەچی بریتی یە لە بەشیکی سەهمی ئەو مەسئەلە.

٤- بەشە سەهمە دەرچوەکە جارانی مەسەلەکەی دەکەین تا بەشی هەموان دەربچێ دەبیت الجامعە الکبری

٥- بۆ دەرهینانی الجامعەالکبری ئەوا جامعەی صغری جارانی ٢ دەکەین کە تەقدیراتی مەسەلەکەیە

٦- بەشی هەریەك لە میراتگرانی هەردوو مەسئەلە کۆدەکەینەوە و لە ژیر جامعەی کبری دادەنێین .

نمونە:- کەسێك مردوە لەپاشی بەجێماوە ﴿ کور – کچ – منالیکی نێرموك ﴾ئومیدی رۆن بونەوە هەیە دیارکەوی:

| | ٥ | ٤ | ٤ | ٥ | الجامعه ٢٠ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کچ | ١ | ٤ | ١ | ٥ | ٤ | ٠ | ١ |
| کور | ٢ | ٨ | ٢ | ١٠ | ٨ | ٠ | ٢ |
| نیرەموك | ٢ | ٨ | ١ | ٥ | ٥ | ٣ | ٠ |
| تقدير | نير | | مىَ | | ٢٠-١٧=٣ راگ | نير | مىَ |

نمونە ٢ :- کەسێك مردوە لەپاشی بەجێماوە : (کور – منالیکی نیرەموك ) ئومێدی رۆن بونەوە نیە.

| | ٢ | ٣ | ٣ | ٢ | الجامعه الصغرى ٦ | الجامعه الكبرى ٦×٢=١٢ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| کور | ١ | ٣ | ٢ | ٤ | | ٧ |
| نیرەموك | ١ | ٣ | ١ | ٢ | | ٥ |
| تقدير | نير | | مىَ | | | |

نمونە٣:- ژنێك مردوە لەپاشی بەجێماوە :- ﴿ مێرد- داك – منالیکی لەباب نێرەموك﴾ ئومید هەیە رۆن بیتەوە:

| | ٦ | | ٤ | ٦ عول ٨ | | ٣ | الجامعة ٢٤ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ميرد | ٢\١ | ٣ | ١٢ | ٢\١ | ٣ | ٩ | ٩ | ٣ | ٠ |
| داك | ٣\١ | ٢ | ٨ | ٣\١ | ٢ | ٦ | ٦ | ٢ | ٠ |
| نيرەموك لە باب | ب | ١ | ٤ | ٢\١ | ٣ | ٩ | ٤ | ٠ | ٥ |
| تقدير | نير | | | مێ | | | ٢٤-١٩=٥ راگ | نير | مێ |

ئەگەر لە ناو ميراتگران زياتر لە نێرەموكيك هەبێ :-

لەو حالەتەدا مەسئەلەيەكى ئاسايى حەل دەكەين بەلام:

١- تەقديراتەكان زياد دەكرى هەر نيرەموكيك دوو تەقديرى هەيە ( نير و مێ)

٢- ئەگەر لەو حالەتە بى كە رۆن نابيتەوە ئەوا الجامعە الصغرى جارانى ژمارەى تقديرات واتە دو نيرەموك بن جارانى ٤ دەكەين وە سێ نيرەموك بيت جارانى ٦ دەكەين تا جامعەى كبرى دەردەچێ .

نمونە : كەسێك مردوە لەپاشى بەجيماوە ﴿ كور – ٢ منالى نێرەموك ﴾ ئوميد هەيە رۆن بيتەوە حالى نيرەموكەكان:

| | ٣ | ٢٠ | ٤ | ١٥ | ٥ | ١٢ | ٥ | ١٢ | الجامعە ٦٠ | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| كور | ١ | ٢٠ | ٢ | ٣٠ | ٢ | ٢٤ | ٢ | ٢٤ | ٢٠ | – | ١٠ | ٤ | ٤ |
| نيرەموك | ١ | ٢٠ | ١ | ١٥ | ٢ | ٢٤ | ١ | ١٢ | ١٢ | ٨ | ٣ | ١٢ | – |
| نيرەموك | ١ | ٢٠ | ١ | ١٥ | ١ | ١٢ | ٢ | ٢٤ | ١٢ | ٨ | ٣ | – | ١٢ |
| تقدير | نير– نير | | مێ مێ | | نير مێ | | مێ نير | | ٦٠-٤٤=١٦ | ن ن | م م | ن م | م ن |

نمونە : كەسێك مردوە لەپاشى بەجيماوە ﴿ كور – ٢ منالى نێرەموك ﴾ هيچ ئوميد نيە رۆن بيتەوە حالى نيرەموكەكان:

|  | ٣ | ٢٠ | ٤ | ١٥ | ٥ | ١٢ | ٥ | ١٢ | الجامعه الصغرى ٦٠ | الجامعه الكبرى<br>٦٠×٤= ٢٤٠ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| كور | ١ | ٢٠ | ٢ | ٣٠ | ٢ | ٢٤ | ٢ | ٢٤ |  | ٩٨=٢٤+٢٤+٣٠+٢٠ |
| نيرەموك | ١ | ٢٠ | ١ | ١٥ | ٢ | ٢٤ | ١ | ١٢ |  | ٧١=١٢+٢٤+١٥+٢٠ |
| نيرەموك | ١ | ٢٠ | ١ | ١٥ | ١ | ١٢ | ٢ | ٢٤ |  | ٧١=١٢+٢٤+١٥+٢٠ |
| تقدير | نير–<br>نير |  | مێ<br>مێ |  | نير<br>مێ |  | مێ<br>نير |  |  |  |

---

# ( مردنی میراتگران بەیەکەوە)

ئەمە لەکاتێکە دوو میراتگر یان زیاتر بەیەکەوە دەمرن بە سوتان یان روداو یان هەر کارەساتێك بێت .

ئەمانە پێنج حالەتیان هەیە :

حالەتی یەکەم :- بزانرێ کەوا کام لە میراتگران پیش ئەوەی تر مردووە ئەوا ئەوەی دواتر مردوە میراتگری مردوی یەکەم مەسەلەکە دەبی بە موناسخە .

حالەتی دووەم:- بە تحقیق بزانری کە میراتگرەکان بەیەکەوە مردون لەیەك سات و کات دا ئەوا نابن بە میراتگری یەکتری بە ئیجماعی زانایان میراتی هەریەکەیان دەدری بەمیراتگرەکانیان جگە لەوەی لەگەڵی مردوە.

حالەتی سێیەم :- نەزانری کامەیان پیش ئەوەی تر مردوە یان بەیەکەوە .... واتە دیار نیە.

حالەتی چوارەم :- دەزانری یەك پیش ئەوەی تر مردوە بەلام دیار نیە کامەیانە.

حالەتی پێنجەمین:- زانرا کە کامیان پیش ئەوەی تر مردوە بەلام لەبەر زۆر بەسەرچونی ماوەکە لە بیریان کرد یان شاهیدحال هەبو ئەویش مردبو ...

لە سێ حالەتەکەی کۆتایی (٣-٤-٥) دا زانایان بۆچونی جیایان هەیە لەسەر دوو قەول :-

قەولی یەکەم:- میرات لەیەك ناگرنەوە ئەمەش قەولی جمهوری زانایانە لە مالکی و حنەفی و شافعی رەحمەتی خوا لەسەریان بێ ، بەلگەیان ئەمەیە:

ا- صحابە بەم شیوەیە حوکمیان کردوە لە کژراوەکانی یەمامە و صفین میراتەکانیان دا بەو میراتگرانەی ماون جگە لە مردوەکان بەیەکەوە .

ب- لە مەرجەکان بون بە میراتگر : بە تحقیق دەبی میراتگر دزای مردوەکە ژیانی هەبوبی گەر بۆ چەند چرکەیەکیش بی ئەوەش دیار نیە کەواتە نابن بە میراتگری یەکتری .

قەولی دووەم :- قەولی ئیمام ئەحمەدە رەحمەتی خوای لەسەر بێ بەم شیوەیە :

١- ئەگەر هاتوو میراتگرەکان ناکۆك بون و نەگەیشتن بەیەك و هەریەکەو ئیدعای ئەوەی دەکرد مردوەکەی ئەو دوای ئەوەی تر بوە و هیچ بەلگەشیان بە دەستەوە نیە وەیان بەلگە هەیە بەلام بەلگەکان دژ بەیەکترن لەو کاتە قبول ناکری و بەلگەی هەردولا بەتالە و داوای سویند لە هەردولا دەکرێ گەر هەمویان سوێدیان خوارد ئەوا مردوەکان نابن بە میراتگری یەکتری.

٢- كيشەو ناكۆكی نيە لە نێوان میراتگران لەوكاتەی هەریەك لە مردوەكان میرات لەوە دەگرن كە پیی دەگوتری - تلاد- واتە مالی كۆنی هەبوە پیش مردنیان و ئەوەی تر میراتی لەو مردیە ناگری كە لەگەلی مردوە و پیی دەگوتری - طريف - واتە نوی ئەوە تەنها دەدری بە میراتگرە زیندوەكان بەلگەشیان ئەوەیە : قسەی ئیمامی عومەر رەزای خوای لەسەربێ لە مردوەكانی نەخۆشی تاعون بیان كەن بە میراتگری یەكتری. واتە هەندیك لەهەندیك دەبن بەمیراتگری یەكتری.

وە راجح قەولی یەكەمە چونكە بەلگەكەی بەهێزترە و بەلگەی قەولی دوەم لاوازە چونكە ئەوەی ریوایەت كراوە لە پیشەوا عومەر پیچەوانەی ئەو قسەیە كەباس كر اوە .

## رێگای حەل كردنی ئەم جۆرە روداوانە :-

یەكەم :- وادادەنێین كە یەكیان پێش ئەوەی تر مردوە و مردوی دوەم دەكەین بە میراتگری مردوی یەكەم و مەسەلەیەكی ئاسایی حەل دەكەین پاشان وا گریمان دەبەین ئەوەی دوەم پاشی ئەوەی یەكەم مردوەو مەسەلەیەكی تر دروست دەكەین و وەكو موناسخە حول دەكرێ.

دووەم:- مەسەلەكە بەپیچەوانە حەل دەكەین واتە خالی یەكەم پیچەوانە بكەوە .

نمونە : ژن و مێردێك بەیەكەوە خنكان بەلام نەزانرا كامیان پیش ئەوەی تر مردوە ، میراتگری ژنەكە( داپیر ،كچ، مام ) وە میراتگری مێردەكە ( كچ - مام ) :-

١- وا دادەنێین مێردەكە سەرەتا مردوە پیش ژنەكە:

| ژن | كچ | مام | مەسئەلە | الجامعە | |
|---|---|---|---|---|---|
| ٨\١ | ٢\١ | ع | ٨ | ٤٨=٨×٦ | |
| ١ | ٤ | ٣ | | | |
| ٦=٦×١ | ٢٤=٦×٤ | ١٨=٦×٣ | | | |
| كچ | داپیر | مام | | | |
| ٢\١ | ٦\١ | ع | ٦ | | |
| ٣ | ١ | ٢ | | | |

٢- وا دادەنێین كە ژنەكە پیش میردەكە مردوە :

| میرد | كچ | داپیر | مام | مەسئەلە | الجامعە |
|---|---|---|---|---|---|

| ٤\١ | ٢\١ | ٦\١ | ب | ١٢ | ٢×١٢=٢٤ |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| ٣ | ٦ | ٢ | ١ | | |
| ٢×٣=٦ | ٢×٦=١٢ | ٢×٢=٤ | ١×٢=٢ | | |
| كچ | مام | | | | |
| ٢\١ | ب | | ٢ | | |
| ١×٣=٣ | ١×٣=٣ | | | | |